ناهیدە ئەحمەد

# سەرەتایەک دەربارەی
# سەرهەڵدانی ئەدەبی منداڵانی کورد

کوردستان – هەولێر

**2005**


**ناوی کتێب: سەرەتایەک دەربارەی**
**سەرهەڵدانی ئەدەبی منداڵانی کورد**

- نووسینی: ڕێواس ئەحمەد
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال ڕواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٥
- ژمارەی سپاردن: ١٣٠
- تیراژ: ٧٥٠
- نرخ: ١٥٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب – ١٠ – (١١٣)

**ناونیشان**
**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
**هەولێر – پشت ڕۆژنامەی خەبات**
**پۆستی ئەلکترۆنی:** asokareem@maktoob.com
**ژمارەی تەلەفۆن:** ٢٢٦٠٣١١




## له جیاتی پێشەکی

ئەم نووسراوەی کە لە دوو توێی ئەم کتێبەدا خراوەتە ڕوو. چەند بەشێکی دکتۆرانامەیەکە کە لە ساڵی ١٩٨٦ لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی مۆسکۆ پێشکەش کراوە.

چەندان لاپەڕەو بەشی ئەم نامەیە لێرەدا نەکراون بە کوردی. بەشێکیان لەبەر ئەوەی بۆ خۆێنەری کورد پێویست نین، بەشێکیشیان زیاتر پێداویستی ئایدۆلۆژی و کارتێکردنی لە سەر خوێندن کردبوونیە پێویست. ،لە سەردەمی سۆڤیەتی جاراندا و دەئاخێنرایە ئەمجۆرە کارانەوە..

جا بە ڕای خۆم سەرجەمی دکتۆرانامەکە یان ئەم شێوەیەی کە ئێستا چاپکراوە، تەنیا سەرەتایەکە بۆ کوتاندنی دەرگایەک کە ڕەنگە زیادەڕۆیی نەبێ ئەگەر بڵێم تا ئێستا نەکوتراوە ئەگەر جۆرە هەوڵدانێکیش بوبێ یان هەبێ وەک ئەم نامەیە ئەوە کارێکی سەرەتایی و کەمە بۆ بابەتێکی وا گرنگ سەبارەت بە ئەدەبی منداڵانی کورد، هەروا لە کاتی نووسین و ئامادە کردنی ئەم نامەیەدا گەلێک کۆسپ و تەگەرەم هاتنە پێش لەوانە نەبوونی هەمو ئەو سەرچاوە و بەرهەمانەی کە تایبەت بە منداڵن بە تایبەتی ئەو بەشانەی لەحەفتا بە دواوە نووسراون، ئەمە جگە لە نەبوونی هیچ کتێبێک کە چوار چێوە و سیما و تایبەتمەندییە تیۆریە هونەرییەکانی ئەدەبی منداڵانی کورد بگرێتە خۆی.

لە هەل و مەرجێکیش دا کە ئەم نامەیە ئامادە کرا، بواری سەردانی کوردستانم نەبوو تا لە نزیکەوە ئەو شتانە پەیدابکەم. نەبوونیان جۆرە لاوازییەکیان بۆ ئەم بەرهەمە دروست کردووە.

لە لایەکی ترەوە لە کاتی وەرگێڕان و داڕشتنەوەی ئەم بەرهەمەدا لە ڕووسییەوە بۆ کوردیی، لە ڕووی تیۆری و زاراوەی ئەدەبیی و هونەرییەوە تووشی گەلێک گرفت بووم، بە تایبەتی ئێمە هێشتا فەرهەنگێکی تایبەت بە ئەدەب و هونەر نییە، چجای ئەدەب و هونەری منداڵانمان.

بۆیە ناچار بووم بۆ دانانی گەلێک لەو زاراوە و وشانە کەڵک لەهەندێ خوشک و برای خوێندکاری کوردی ئەو کاتەی یەکێتی سۆڤیەت وەربگرم و گەلێک جاریش ناچار بووم پەنا بەرمە بەر نزیکترین وشە کە پێم وابووە مانای مەبەست دەبەخشێت.

لە هەمان کاتدا پێم باشە ئاماژە بەوەش بدەم، کە ئێستا نزیکەی بیست ساڵێک بەسەر مادەکردنی دکتۆرانامەکەدا تێدەپەڕێت، کە ئەم کتێبە بەشێکی پێکدێنێت. لەم ماوەیەشدا نەک





هەر تیۆری و بۆچوونەکان سەبارەت بە ئەدەب و هونەری منداڵان و سیستەمی خوێندن و پەروەردەکردن، گۆڕانکاری قووڵ و کاریگەریان بەسەردا هاتوەو تیۆری و بۆچوونی نوێ سەریانهەڵداوە، بەڵکو گۆڕانێکی قووڵ و مەزن سەرجەمی بزاڤە فکری و تیۆرییە هونەری و ئەدەبییەکان و بگرە تەواوی ژیانیشی گرتۆتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا پێم وایە ئەم کتێبە هێشتا بایەخی خۆی هەیەو بابەتی ئەدەب و هونەری منداڵان، چەندان پڕۆژەو بەرهەمی خۆماڵی و وەرگێڕانی گەرەکەو بوارێکی ئیجگار گرنگ و ناسکەو، ئێمە کەم کارمان تیایدا کردووە.

بەهەر حاڵ هیوادارم ئەم بەرهەمە بتوانێ بۆشاییەک لە کتێبخانەی ئەدەبی منداڵانی کوردا پڕبکاتەوە و توانیبێتم ئەگەر بچوکیش بێت خزمەتێکم کردبێ.....

**ناهیدە ئەحمەد**

# ئەدەبی فۆلکلۆریی منداڵان

باس و توێژینەوەی زانستییانەی ئەدەبیی بایەخ و گرنگییەکی گەورەی لە ژیانی هاوچەرخی نەتەوەی کورددا هەیە. بە تایبەتی لە سەدەی بیستەمدا کە سەردەمێکی نوێ لە بوژاندنەوەی پێوەندییە رۆشنبیری، ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسیەکاندا دەستی پێکردوە. ئەدەبی منداڵانیش توخمێکی ئۆرگانیکی لە ئەدەبی نوێی نەتەوەکەمان و نیشانەیەکی بەرچاو لە ڕادەی پێشکەوتنی فەرهەنگی کوردستاندا پێکدەهێنێت.

ئێمە کۆمەڵێک بەرهەمی شیعر، چیرۆک و مەتەڵی فۆلکلۆری هەمە جۆرەمان بۆ منداڵان هەبووە، ئەم بەرهەمانەش بە شێوەیەکی سەرەکی لە ڕێگەی گێڕانەوە لە نەوەیەک بۆ نەوەکانی تر پارێزراون. ئەدەبی نووسراو بۆ منداڵان، بە دیاردەیەکی نوێ دادەنرێ و لە باشووری کوردستاندا، لە سەرەتای سەدەی بیستەوە سەریهەڵداوە. بۆیە پێویستە ئەم ئەدەبە بە شێوەیەکی دروست و بەجێ دەستنیشان بکرێت و بە چەشنێکی زانستیانە خانە بەند بکرێت، ئاماژە بە قۆناغە سەرەکییەکانی بدرێت.

بە پێی ئەو بەرهەمە چاپکراوانەی دەستم کەوتوون، دەتوانم بڵێم، ئەگەرچی نووسەر و زاناو ڕۆژنامەوانی کورد بایەخیان بە ئەدەبی منداڵان داوە و خزمەتێکی بەر چاویان کردووە، بەڵام بە شێوەیەکی پێویست و لە ڕوانگەی ئەدەبناسیەوە بەرباس و لێکۆڵینەوەیان نەداوە و کاری پێویستیان بۆ نەکردووە. هۆی ئەمەش لەو هەلومەرجە نالەبارەی بواری ئابووری و سیاسی بە دەر نییە، کە ڕێی لە پەرەسەندنی هزر و زانست و جوانناسی نەتەوەی کورد گرتووە.

کاتێک دەڵێین ئەدەبی منداڵانی کورد لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە سەری هەڵداوە، مەبەستمان ئەو ئەدەبەیە کە بۆ ئەوان و بە ئامانجی ڕێنوێنیکردنیان نووسراوە" ئەدەبی منداڵان لەو بەرهەمە نووسراوە زانستی و هونەرییانە پێکدێت کە بە تایبەتی و ڕاستەوخۆ بۆ ئەوان نووسراون، هەروەها بەشێک لەو نووسینانەش دەگرێتەوە کە بۆ گەورەساڵان نووسراون، هەندێ دەستکاری و گۆرانکاریان تێدا کراوە، تا لەگەڵ جیهان و مەودای بیرکردنەوەی منداڵاندا بگونجێنرێن، بە تایبەتی ئەو بەرهەمانەی بۆ ئەدەبی کلاسیک و بەرهەمی میللی دەگەڕێنەوە. ئەمانەش ڕۆڵێکی





مەزن لە پەروەردە کردنی جوانناسی و ڕەوشتی منداڵاندا دەگێڕن و شارەزاییان بەرین دەکەن و بە ژیانەوە گرێیان دەدەن"١".

فەرهەنگۆکی نەوبەهار، کە فەرهەنگێکی ساکاری عەرەبی-کوردییە و کاری شاعیری گەورەی کورد ئەحمەدی خانی یە (١٦٥٠-١٧٠٦)، یەکێکە لەو بەرهەمە هاوچەرخانەی بۆ منداڵان نووسراوە. (عقید)ە کەی مەولەویش (١٨٠٦-١٨٦٠) کە بۆ منداڵ و فەقێ ی حوجرە دانراوە، بەردێکی تری بناغەی ئەم ئەدەبەیە، لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەم نووسراوە. کتێبی (ئەلف وبێ ی کوردی)یش کە زانای گەورە محەمەد باشقە لە ساڵی ١٩٢٠ دا نووسیویەتی بە هەنگاوێکی گرنگ دادەنرێت لە مەیدانی نووسیندا بۆ منداڵ.

سەرەڕای ئەم زانیارییانە ناتوانین ئەدەبی منداڵانی کورد لە ئەدەبی میللی دابڕین. ئەو بەرهەمە فۆلکلۆرییانەی بۆ منداڵان گوتراون و نیوەڕۆکە پێزدارەکانیان شێوەی هونەری جۆر بە جۆریان گرتۆتەخۆ، لە ئەدەبی میللیی کوردیشدا بە بەشێکی سەربەخۆ دادەنرێن.

فۆلکلۆر گرنگییەکی زۆری لە پەروەردەی نەتەوایەتی و، وەئاگاهێنانی ئەندێشە و کار کردنە سەر دەروون و ئاوەزی منداڵ هەبووە. بەلای ماکسیم گۆرکیەوە فۆلکلۆر گۆشکەری منداڵانە بە زمانی دایک و بە ئاگاهێنی چێژی جوانناسییانە" تەنیا پوشکین نەبوو لە زمانی ڕووسی و ستران و حەکایەتەکانی دایەنەکەی بکۆڵێتەوە... بەڵکو لیسکۆف و ئۆسپێنسکی و گەلێک کەسانی دیکەش بوون، کە پاشان داهێنەری زمانی پاراوی ڕووسییان لێهەڵکەوت و هەستیان بە جوانی، ڕەوانی و دووربینیی پەند، مەتەڵ، قسەی خۆش و نەستەقی دایەن، ژنە سەرباز، عارەبانەچی و شوانەکان کرد."٢"

ئەدەبی فۆلکلۆری کورد تاکە ڕەنگدەرەوەی سامانی ڕۆحی گەلە."کورد لە سەر خاکی خۆی بە زەبری ستەم لێک دابڕاون، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە گەلێک جار ئازادی بوژاندنەوەی فەرهەنگی و دەستنووسە نەتەوەییەکانیان لێ زەوت بکرێ، بەڵام کورد لەهەموو زەمانێکدا توانیویەتی یەکێتی خۆی بپارێزێ. فۆلکلۆر لە خۆ ڕاگری و شیلگیرییدا یارمەتی داون و مەحاڵە گیانی زیندو و بیروراو هیوا و ئاواتی گەلێک لەناو ببرێ کە لە ئەدەبی میللی و فۆلکلۆردا بەرجەستەبکرێ". "٣"

نەتەوەی کورد سەر باری هەلومەرجی ئاڵۆز و نالەباری مێژوویی، ڕۆڵێکی بەرچاوی لە دیرۆکی فەرهەنگی ڕۆژهەلاتی ناویندا گێڕاوە، فۆلکلۆری کوردی کە پێکهاتەی گیانێکی ئازادیخوازانە و بابەتی هونەریی هەمە جۆرە و دەوڵەمەندە، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا سەرنجی زانایانی بە لای خۆیدا ڕاکێشاوە و چاپەمەنی سۆڤیەتی – بێگانەی دیکەش– گەلێک داستان، سروود و سترانی سۆزئامێزی قارەمانیەتی، حەکایەت، پەند و قسەی نەستەقی کوردییان بلاو کردووەتەوە. مێنۆرسکی لە گەشتێکدا بۆ سەرانسەری کوردستان(١٩١٤)، لە بارەی گەلی کوردەوە دەڵێ: "کورد خاوەنی ئەدەبێکی میللی هێندە دەوڵەمەندە کە گەلێک حەکایەت و داستانی میللی و ستران دەگرێتە خۆ". ڕۆژ هەلاتناسی سۆڤیەتی (ی.و.فاریزۆف)یش لە پێشەکی کتێبەکەی (نیکیتین)ی کوردناسدا نووسیویە: "فۆلکلۆری کورد لە ڕووی هونەری هەمە چەشنە و بابەتەکانیەوە شوێن و پلەو پایەی لە نێو ڕیزەکانی پێشەوەی فۆلکلۆری ڕۆژهەلاتی ناوین و نزیکدا دیارە""٤"

گرنگی فۆلکلۆر لەو وێنە ڕاستگۆ و دروستەدایە کە شێوەی ژیان، ئاکار، نەریت و بیروباوەڕی ئەم نەتەوەیە دەنوێنێت، کە ستەمدیدەی چەندین سەدەیە، بەلام لە پێناو ئازادی و سەربەخۆیی خۆیدا لە تێکۆشان نەکەوتووە. سروشت و سیمای جەنگاوەرانەی تاکی کوردیش هۆی سەرهەڵدانی گەلێک بەرهەمی فۆلکلۆرین، بە تایبەتی داستان و ئەفسانەی نەبەردی.

گومانی تێدا نییە ژمارەیەک لەو ئەفسانە، داستان، سروود و چیرۆکانەی سێبەر و وێنەی ڕابردووی ئەم گەلە دەنوێنن، دەشێت وەکو بابەتی ئەتنۆگرافیای کورد و هێندێک فاکتەری مێژوویی سەرنج بدرێن و بە کار بهێنرێن.

کشتیارانی کورد لە پاراستنی فۆلکلۆری نەتەوەکەیاندا دەست پاکن و گەلێک شاعیر و ستران بێژ و شایەر لە نێویاندا هەڵکەوتووە. گەردلێڤسکی ئەکادیمست دەگێڕێتەوە کە لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای باکووری کوردستاندا سترانی میللی "کە باس لە نەبەردی پاڵەوانە نیشتمانییەکان دەکات" لە فێرگەی تایبەتی هونەریدا دەخوێندرا و چۆن فێرکارەکان خوێندکاریان بە ئەدەبی فۆلکلۆری ئاشنا دەکرد و مەشقی سترانیان پێ دەکردن و ئەزموون و لێهاتوویی خۆیانیان پێدەبەخشین.





دەتوانین بڵێین لە سەرەتای سەدەی بیستەم تاکو سەرەتای شەستەکانی هەمان سەدە، بەرهەمێکی هێند زۆر و هەمە چەشنە بلاو کراونەتەوە کە لەدووتوێی کتێبێکدا بە ئاسانی جێیان نابێتەوە، دەشکرێت بڵێین لەو ماوەیەدا پرۆسەی پێکهێنانی ئەدەبی منداڵانی کورد وەکوو ژانرێکی سەربەخۆ و توخمێکی ئۆرگانی ئەدەبی نەتەوەکەمان پێگەیشت. هەر لەو ماوەیەدا شێوە و ناوەڕۆک بە شێوازە هونەرییەکانی ئەدەبی منداڵانەوە تا ئاستێکی باش دەرکەوتن. بۆیە من لەم لێکۆڵینەوەیەدا پەنا دەبەمە بەر ئەو نووسین و بەرهەمانەی لە نێوان بیست و شەستەکانی سەدەی بیستەمدا بۆ منداڵان نووسراون، بەلام خۆم لە بەرهەمەکانی حەفتاو هەشتاکان پاراستوە، چونکە هەم دەکەونە دەرەوەی لێکۆڵینەکەوە و هەم کارێکی ئەدەبی بەرفراوانی مێژوویی لە خۆدەگرن.

ئامانجی من لەم لێکۆڵینەوەیەدا باسکردنێکی گشتیی پرۆسەی سەرهەڵدانی ئەدەبی منداڵانی کوردە و پەرەسەندنی پلە بە پلەی ئەم ئەدەبەیە لە ڕەوتی مێژوویی نەتەوەی کورددا، ئەم خالانەی خوارەوەم ڕەچاوکردوون.

١- بابەتی کۆمەلایەتی و هونەری و زانستی تایبەت بە ئەدەبی منداڵانی کوردم کۆکردوونەتەوە و کەڵکم لە ئەزموونی ڕۆژنامەوان و مامۆستای کورد و پسپۆرانی ئەدەبناس و بایەخدەران بەم ئەدەبە، وەرگرتووە.

٢- بابەت و شیعر و پەخشانی قۆناغە جیاجیاکانی مێژووی ئەدەبی منداڵانی کوردم شیکردوونەتەوە.

٣- بەرهەمی تایبەت بە منداڵانم لە کتێبی نووسەر و شاعیرە ناسراوەکاندا هەڵبژاردووە و ئاماژەم بە ڕۆڵی سەرەکی شاعیرانێک وێنەی زێوەر، بێکەس، پیرەمێرد و گۆران کردووە.

٤- تایبەتمەندی میراتی نەریتی میللی و هۆنراوەی شاعیرانێکم دیاری کردووە، کە لە نووسینی ئەدەبی منداڵاندا سودیان لە فۆلکلۆری کوردی و شیعری کلاسیکی کوردی وەرگرتووە.

٥- سەر هەڵدان و گەشە کردنی ڕیالیزم لە بەرهەمی ئەدەبنووسانی منداڵاندا بە شێوە و شێوازی ڕۆمانسییەوە گرێداوە.

٦- ئاستی کارلێکردنی ئەدەبی وڵاتانی دراوسێ، بە تایبەتی تورکی، فارسی، عەرەبی، هەروا ئەدەبی ئەورووپای ڕۆژ ئاوام لە سەر ئەدەبی منداڵانی کوردستان دیاری کردووە.

٧- شێوەی زمان، ڕەوانبێژی، هونەری تایبەت بە منداڵانی کوردم بە سەر یەکەوە و شێوازی هەر نووسەرێکم بە جیا باس کردووە.

گرنگی لێکۆڵینەوەکە:

ئێستا کە تێکۆشانی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی لە کۆمەڵگای کوردستاندا گوڕ و تینی تێگەڕاوە، ئەدەبی منداڵان لە توێی ئەدەبی کوردیدا لە ناو جەرگەی سەنگەرەکانی ئەم مەیدانەدا جێی خۆی کردوەتەوە، ئەدەبی منداڵانی کورد بە هەموو بەشەکانیەوە لە ڕزگاری، ئازادی، نەمانی ستەم، خۆشەویستی نیشتمان و ناکۆکی نێوان ڕاست و چەوت دەدوێت.

ئەدەبی منداڵانی کورد بە شێوەیەکی گشتی لە کەش و هەوایەکی دیموکراتییانە و پێشکەوتنخوازانەدا سەری هەڵداوە و ڕەنگدەرەوەیەکی ساکار و خوڕسکانەی ژیانی کوردەواری بووە و بە زمانی منداڵ و بۆ منداڵ نووسراوە، ئا لێرەدا ڕووی گەشی ئەدەبی منداڵانی کورد دیاردەکەوێت، بەڵام لەباری هونەرییەوەگەلێک کەلەبەرو کەلێنی گرتۆتە خۆ، ئەمەش ئەرکێکی هونەریی و هەنووکەیی دەخاتە ئەستۆی نووسەرانی ئەدەبی منداڵان لە ڕۆژگاری ئێستادا.

جێگای داخە تا کو ئێستا - ١٩٨٠- (مەبەستم دەست پێکردنی لێکۆڵینەوەکەیە) بەرهەمێکی ئەوتۆم بەر چاو نەکەوتووە، ناوەرۆکی هونەری، فکری و شیعر و پەخشانی منداڵان بە شێوەیەکی زانستیانە و بە زمانی کوردی بخاتە ڕوو.

لە کاتێکدا ئەدەبی منداڵان لە هەر ئەدەبێکی دیکە زیاتر پێویستی بە ئامانجی ڕوون و بۆچوونی ساغ و شێوازی زانستیانەی دروست هەیە، کەمی سەرچاوەی تیۆری لە بارەی ئەدەبی منداڵانی کوردەوە یەکێک بووە لەو کۆسپە سەختانەی هاتووەتە ڕێم. بۆیە لە شیکردنەوەی لایەنی کۆمەڵایەتی و زانستیدا پشتم بەو نووسین و وتارانە بەستووە، کە لە بیستەکانەوە تا هەشتاکانی ئەم سەدەیە، لێرەو لەوێ، لە چاپەمەنییە کوردی و عەرەبییەکاندا بڵاو کراونەتەوە، یان کەڵکم لە چەند نامیلکەیەک دەربارەی لایەنی هونەری شیعرو پەخشان بینیوە، وێنەی شیکردنەوەی کورتە چیرۆک لە ئەدەبی منداڵانی کوردا و جەوهەری ئەدەبی منداڵانی کورد و سەرەتا و پەرەسەندنی کە باسی شێوە و ناوەرۆکی هونەرییانەی ئەدەبی منداڵانی هێندێک لە نووسەرانی حەفتاکانیش دەکەن.





عەبدولغەنی عەلی یەحیا، کە نووسەری (جەوهەری ئەدەبی منداڵانی کورد و....)ە، هەوڵی داوە کە لایەنی هزری و ڕەوانبێژی چیرۆکەکان بابەتییانە هەڵسەنگێنێت و کۆمەڵێک پێشنیاز و سەرزەنشتی بۆ نووسەران و درێژە دان بە کارەکانیان، خستۆتە ڕوو. هەمان نووسەر وتاری (بابەتە فۆلکلۆرییەکان لە ئەدەبی منداڵاندا) دەربارەی کەڵکی بابەت و کەسایەتی فۆکلۆری و بەکار هێنانیان لە ئەدەبی منداڵاندا، بڵاو کردووەتەوە. لێرەدا نووسەر داوا لە ئەدیبان دەکات بایەخ بە سامانی شیعری نەتەوەیی بدەن و تێکەڵ بە کاری داهێنەرانەیان بکەن، نەک کتوومت خۆی بگوێزنەوە.

هەروا سوودم لە نووسەرانی دیکەی کورد وەرگرتووە کە بایەخیان بە ئەدەب و هونەری منداڵان داوە لەم ڕووەوە، لە بەشی دووەمی ئەم کارەدا کە بۆ پەخشانی هونەری منداڵان تەرخان کراوە، بەرهەمە سەرکەوتووەکەی عەبدولواحید نوری (پیرۆزی منداڵ) م وەکوو بنەما بەکار هێناوە، سەرەڕای ئەمە سوودم لە ژمارەیەکی تایبەتی گۆڤاری نووسەری کورد بینیوە کە یەکێتی نووسەرانی کورد لە ساڵی ١٩٧٩ دا، -ئەو ساڵە لە لایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانەوە بە ساڵی جیهانی منداڵان ناودێر کرا - بۆ ئەدەبی منداڵان تەرخان کردبوو.

لەو ژمارەیەی گۆڤارەکەدا نووسەر عەبدولرزاق بیمار، وتارێکی لە بارەی تیۆری و ئەدەبی منداڵانەوە نووسیوە، کە باسێکی ڕەخنەگرانەیە دەربارەی ئەدەبی منداڵان لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا. نووسەر لێککگرێدانی لایەنی پەروەردەو جوانناسی لە ئەدەبی منداڵاندا بە گرنگ دەزانێت، بۆ ئەوەی منداڵ شارەزاییەکی فراوان دەستەبەربکات و خوێنەرێکی بە زەوقی لێ هەڵکەوێت.. سەرەتاکانی ئەدەبی منداڵانی کوردی دیاریکردووە و ئاماژەی بە بەرهەمی چەندان شاعیر بۆ وێنە:زێوەر و پیرەمێرد و بێکەس و گۆران و... داوە.

لە هەمان ژمارەدا کەمال میراودەلی وتاری (منداڵ و ئەدەبی منداڵان)ی بڵاو کردوەتەوە و تێیدا خۆی لە قەرەی سایکۆلۆژیای منداڵ داوە، نووسەر دۆزینەوەی کاریگەریەتی جوانناسی لە سەر هەست و نەستی منداڵ بە ڕێی بڵاوکردنەوەی بابەتی گونجاو و سوود بەخش، بە گرنگ دەزانێت.

هەر لە هەمان ژمارەدا بابەتی نووسەران: ئازاد عەبدولواحید، عوسمان هەورامی، زەکی

هەناری، هاشم کۆچانی و ئیبراهیم قادر، لە گەڵ چەند وتارێکدا کە ناوی نووسەرەکانیان نەهێنراوە، وێنەی (کۆڕی پەروەردەیی و ئەدەبی منداڵان)، بڵاو کراونەتەوە. ئەو کۆڕو کۆبوونەوانەی نووسەرانی کورد لە بارەی ئەدەبی منداڵانەوە سازیان کردووە گەلێک بابەتی بە کەڵکیان تێدا باس کردووە، لەوانە سیمیناری نووسەرانی کورد لە سلێمانی.

لێرەدا دەکرێت ئاماژە بەو دوو نامەیە بدەین کە دەربارەی شاعیران گۆران و پیرەمێرد پێشکەش کراون، تێیاندا باس لە سەرجەمی چالاکییە هونەری و داهێنانەکانی ئەم دوو شاعیرە مەزنە کراوە کە گەلێک بەرهەمیان بۆ منداڵان نووسی.







## لە فۆلکلۆرەوە بۆ ئەدەبی نووسراو

بەندی یەکەم – دەربارەی خانە بەند کردنی فۆلکلۆری منداڵان لە فۆلکلۆرناسیی سۆڤیەت و رووسدا.

فۆلکلۆری منداڵان زاراوەیەکە لەم سەردەمەی دواییدا بە کار هێنراوە و تاکو ئێستا تێڕوانینێکی یەکگرتووسەبارەت بە پێناسەی ئەم فۆلکلۆرە نەچەسپاوە، کۆی بەرهەمی ئەدەبیی نەتەوەیەک دەگرێتەوە کە تایبەت بە منداڵانە و پشتاوپشت و زارەکییانە پارێزراوە. فۆلکلۆرناسانێک هەن تەنیا ئەو بەرهەمانە بە فۆلکلۆری منداڵان دادەنێن کە لە لایەن منداڵان خۆیانەوە دانراون و ئەنجامدراون، بۆیە بەر لەوەی سەرنجی سیستەمی فۆلکلۆری منداڵانی کورد بدەین، بە گرنگی دەزانم ئاوڕێک لە خانەبەندکردنی فۆلکلۆری منداڵان لە ئەدەبی سۆڤیەت و رووسیدا بدەینەوە.

لە سەدەی نۆزدەیەمدا، کە هێشتا زاراوەیەکی گشتی، پڕ شێوەی جۆراو جۆری کارو بەرهەمە فۆلکلۆرییەکانی منداڵان ساز نەکرابوو، فۆلکلۆرناسان زاراوەی -گۆرانیی منداڵان- گۆرانیی یاری، قسەی خۆشی منداڵان، و مەتەڵیان لە بری فۆلکلۆری منداڵان بە کاردەهێنا.

گ.س.ڤینۆگرادۆڤ، کە بە تۆێژەرەوەی ناسراوی ئەم مەیدانە دادەنرێت و بەرهەمێکی زۆری لەم بوارەدا نووسیوە و پێوەندی نێوان فۆلکلۆری منداڵان و هەلومەرجی ژیانی نەتەوەی ئاشکرا کردووە، یەکەم کەس بوو زاراوەی(فۆلکلۆری منداڵان)ی بە کار هێنا و لە کتێبی(پەروەردەکردنی میللی....)، ١٩٢٦ دا پێناسەیەکی زانستییانەی بۆ فۆلکلۆری منداڵان داهێنا: " فۆلکلۆری منداڵان ئەوکار و بەرهەمانەیە کە لە بەرهەم و کاری گەورە ساڵان جیا دەکرێنەوە، ئەو بەرهەمانەیە کە منداڵان دایان دەهێنن و خۆیشیان گوێی لێدەگرن"."٥"

ئا.و.کاپیتسا لە کتێبی (فۆلکلۆری منداڵان)دا سەرنجێکی تایبەتیی شیعر دەدا لە فۆلکلۆری منداڵاندا و بە شێوەیەکی هونەریانە فۆلکلۆری منداڵان خانەبەند دەکات و لە هەلومەرجی ژیان، بیروبۆچوون و باری دەروونی منداڵان دەکۆڵێتەوە، دەنووسێت" مەبەستمان لە فۆلکلۆری منداڵان داهێنراوی گەورەکانە بۆ منداڵان، هەروەها داهێنراوی لاساییکارانەی خودی منداڵانە... ئەگەر بمانەوێت فۆلکلۆری منداڵان وەکوو بوارێکی سەربەخۆ جیا بکەینەوە دەبێت دوو هۆکاری گرنگ لەبەرچاو بگرین: ژیان و ئاوەزی منداڵان" "٦".

هەلو مەرجی ژیانی منداڵان جیاوازییەکی هێندە زۆری لە گەڵ ژیانی گەورەدا نییە، هەرچەندە دنیای منداڵان لە تەمەنێکەوە بۆ تەمەنێکی تر دەگۆڕێت بەشێکی زۆری هیچ پێوەندییەکی بە ژیانی گەورە ساڵانەوە نییە، شێوەی فۆلکلۆری منداڵان پێوندییەکی پتەوی بە ئاوەزی منداڵەوە هەیە و زەوق و خاسیەتی تایبەتمەندی تێگەیشتنیان دیاریدەکات، هەروەها گوتنەوە و لاسایی کردنەوەی دەنگ و دووپات کردنەوەی پیتە دەنگدارەکان و زۆر شێوازی دیکەی داهێنانیش دەگرێتەوە. توێژەرەوە هاو چەرخەکان بایەخێکی زۆر بە فۆلکلۆری منداڵان دەدەن.

ڤ.ب.ئا.ئەنیکین لەکتێبەکەی "پەندو مەتەڵی میللی رووسی و فۆلکلۆری منداڵان"دا بە وردی باسی هونەرەکانی فۆلکلۆری منداڵان دەکات و لە دارشتنی بابەتە تیۆرییەکانی فۆلکلۆردا بەشدارییەکی دیاری کردووە، بە لای ئەوەوە بەرهەم و داهێنانی گەورە ساڵان بۆ منداڵان و داهێنانی خودی منداڵانیش بە فۆلکلۆری منداڵان دادەنرێن، نووسەرانێکی تریش هەن کە لەم رووەوە هاورای ئەنیکینن.

بە رای هەندێ لە زانایانی سۆڤیەت، فۆلکلۆری منداڵان تەنیا ئەو کار و داهێنراوانە دەگرێتەوە کە بەرهەمی هەست و خوستی منداڵانن، بەم پێیە ئەو بەرهەمەی کە گەورە ساڵان بۆ منداڵان نووسیویانە، بۆ نموونە بەرهەمە داهێنەرەکانی ن.ب.ئەندریێڤ و ب.ی.چیچریۆڤ نووسیویانە بۆ منداڵان لە چوارچێوەی فۆلکلۆری منداڵان دەردەهێنرێن، بەلای ئەوانەوە لایلایە و لاواندنەوە و لوری لە نێو بەرهەمی گەورە ساڵاندا هونەرێکن جیا هەڵکەوتوو.

کرافتسۆڤ و لازوتین خاوەنی هەمان ڕان و تەنیا ئەو کار و بەرهەمانە بە فۆلکلۆری منداڵان دەزانن کە لە داهێنان و نواندنی منداڵان خۆیانن، فۆلکلۆری ئەوان لە ڕووی شێوە و ناوەڕۆکەوە



لە فۆلکلۆری گەورە ساڵان جیاوازە.بەڵام هەردووکیان وا دەزانن کە بەرهەمی گەورە ساڵان بە پێی هزر، هەست و نەستی منداڵان پاش گونجاندنیان بۆ نێو فۆلکلۆری منداڵان دزە دەکات لەو کاتەشدا دەکرێت بڵێین خاسیەتی فۆلکلۆری منداڵان وەردەگرێت."٧"

هەرچی خانەبەندکردنی هونەری فۆلکلۆری منداڵانیشە، تاکوو ئێستا یەک دەنگییەکی تەواو لە بارەیەوە گەڵاڵە نەبووە، ن.ی.گرافتسۆف و.س.گ.لازوتین و ئا.م.نۆڤیگەڤە"٨" فۆلکلۆری منداڵان، بە پێی داهێنانی منداڵان، بە دوو بەش دەگرن:

١- یاریی فۆلکلۆری منداڵان.
٢- فۆلکلۆری منداڵان لە دەرەوەی یاری کردندا.

مەبەستی نووسەرانی ناوبراو لە یاریی فۆلکۆری منداڵان ئەمانەن:

١- پشکهاویشتن.
٢- ژمارەکێ: ئەو یارییانەی ژمارەیان تێدا بە کار دەهێنرێن.
٣- ئەو جۆرە یارییانەی ڕۆڵی درامی و ستران و پێشبرکێ و بێدەنگی و خۆڕاگرتن و سترانی چیرۆک ئامێز دەگرنە خۆ.

هەرچییەکیش دەکەوێتە دەرەوەی یاری کردن، جۆرە فۆلکلۆرێکی منداڵانە کە پێویستی بە جموجۆڵ و جێگۆرکێ نییە وەکو: هەڵهێنان و گورج گوتن، پێدا هەڵدان، ناوو ناتۆرە و قومار و تەشقەڵە بە یەک کردن.

شایانی باسە ئەنیکین حکایەت و مەتەڵۆک و مەتەڵ و فاڵی منداڵان بە هونەری فۆلکلۆری منداڵان دانانێت، هەرچی فاسیلینکۆیە سترانی بازنە سەما، لە لەگەڵ ئەو هونەرانەی ئەنیکین لە جغزی فۆلکلۆری منداڵاندا خانەبەندی کردوون، بەجۆرێک لە هونەری سترانی یاری کردن دەزانێت."٩"

فۆلکلۆرناسە هاوچەرخەکان دوو پێشنیار دەهێننەوە، کە ڤینۆگرادەف و کاپیتسا لە بارەی خانە بەند کردنی فۆلکلۆری هونەری منداڵانەوە خستویانەتە روو، ڤینۆگرادەف"١٠" فۆلکلۆری منداڵان بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش دەکات:





هۆنراوەی دایکان: ئەو بەشەی ئەدەبی منداڵان دەگرێتەوە کە نەتەوە بە نیازی پەروەردەکردنی منداڵ خوڵقاندویەتی. ئەم بەشە گشت بەرهەم و داهێنراوێک دەگرێتەوە کە دایک، دایەن، داپیرە و کەسانێکیش دایان هێناون کە پێوەندییەکی راستەو خۆیان بە منداڵ و پەروەردەکردنەوە هەبووە.

ئەم بەشە بە سەر ئەم لکانەدا دابەش دەکرێت:

١- لاواندنەوە

٢- نازناو لێنان

٣- بێرە و سترانی منداڵ خافلاندن

٤- دووپاتکردنەوە

٥- قسە هەڵبەستن.

بەرهەمی داهێنەرانەی منداڵان: ئەو کارو بەرهەمانە دەگرێتەوە کە لەلایەن منداڵانەوە داهێنراون و بە فۆلکلۆری راستەقینەی منداڵان دەزانرێت.

بەرهەمی داهێنەرانەی گەورە ساڵان: ئەو بەرهەمانە دەگرێتەوە کە گەورە ساڵ نووسیونی و هاتونەتە نێو فۆلکلۆری منداڵانەوە، ئەم بەشەش بەرهەمی زارەکی میللین، شێوە جیاجیاکان دەگرێتەخۆ، بۆ وێنە سترانی بانگ هەڵدان و پێدا هەڵدان کە ڤینۆگرادەف دەڵێت شێوازێکی پێکەنیناوی وەردەگرێت و بە هۆنراوەی ویژدانی وخورافە ناو دەبرێت.

بەڵام کاپیتسا خانەبەندییەکی دیکەی بۆ فۆلکلۆری منداڵان هەیە، کە جیاوازییەکی زۆری لە گەڵ پێشنیازەکەی ڤینۆگرادەف نییە، لە پێناسەی فۆلکلۆری منداڵاندا دەڵێت" پێش هەموو شتێک پێوبستە ئەو گۆرانییانە بە زەقی بخرێنە روو کە پێوەندییان بە هێور کردنەوە و لاواندنەوەی منداڵان و بە خەواندنیانەوە هەیە"[١١]. داهێنانی گەورە ساڵان بۆ منداڵان کە بە لۆری ناسراون، لە لاواندنەوەو قەڵاندۆش و بەرزهەڵدانی منداڵ و راژاندن و دیلانی و هەرزانێ پێکردن و یاری کردن بە قامکی منداڵ پێک دێن، بەڵام بەشی دووەمی فۆلکلۆری منداڵان ئەو بەرهەمانەن کە پێوەندییەکی هەمیشەییان بە سروشت و ئاژەڵەوە بە شێوەی ژیانی گوندەکی منداڵەوە هەیە و سترانی تایبەتی بۆ تەرخان کراوە، بۆ نموونە هەیاران و مەیاران، خۆردەرکەوتن، پەلکە زێرینە و بەهار و باڵندە، یان پێوەندییان بە نیگار و وێنە و بۆنەی کاتییەوە هەیە کە بۆ





رۆژی دیاریکراو داهێنراون؛ نموونەی سترانی سەری ساڵ، جەژنە پیرۆزەو منداڵاندا کۆ بکرێنەوە. دوایی کاپیتسا کۆمەڵێک کاری دیکەی هونەری بە جیاباس دەکات، لەو گۆرانییانە پێکدێن کە بێ مەبەستێکی تایبەت وتراون. رەنگە هەر واتاشیان نەبێت وەکو: "هەللور بللور تەکامە. .." ئەوانەی لە پرسیار و وەڵام، هەلومەرجی ژیان، کشتکاری، گوندنشینی رۆژانی هەفتە و ئەلف و بێ دەدوێن.

دیارە گەر جیاوازییەک لە نێوان خانەبەندییەکەی کاپیتسا لە لایەکەوە و کرافتسۆف و لازوتین و نۆڤیکەڤە لە لایەکی دیکەوە هەبێت، هەم لە بەشی چیرۆکدایە کە پێوەندی بە ژیانی گوندنشینەوە هەیە و هەم لەو بەشەیشدایە کە لە ژێر ناوی (تعاویز) دوعاو نوشتە و فاڵ، کە لای نووسەرانی پێشوو، بەههمان شێوە، وەکوو بەشێکی تایبەت دیاری نەکراوە.

بەم شێوەیە و بە پێی بۆچوونەکانی کاپیتسا و ئەنیکین وپۆمێرانتسێڤا و ڤاسیلێنکا و مالینکوڤە کە بە لای منەوە پێشنیاری دروست و بە جێن، دەبێت فۆلکلۆری منداڵان لە تێکچنەی سێ ئەڵقە پێک بێت:

بەرهەم و نووسینی گەورە ساڵ بۆ منداڵان و بەرهەم و داهێنراوی گەورە ساڵان کە بێ دابڕان کار لە منداڵان دەکەن، مەبەستی سەرەکییان پەروەردەکردنی منداڵە.

لێرەوە دەگەینە ئاستی پرسیارێک کە دەڵێ: کامانەن ئەو بەرهەمانەی کە دەکرێت بە فۆلکلۆری منداڵان دابنرێن؟

بیروڕای زانایان لە رووی ئەم پرسیارەدا جیاوازە، بۆ نموونە هەندێکیان حیکایەت و مەتەڵ و مەتەڵۆکە و نزا و پاڕانەوە و رازو نیاز گرتن نادەنە پاڵ فۆلکلۆری منداڵان، بەڵام هێندێکی دیکەیان ئەم بابەتانە بە فۆلکلۆری منداڵان دەزانن، لە ئاکامی ئەم جیاوازییەشدا دەکرێت چەند ئەنجامێک گەڵاڵە بکەین، بۆ:

بەرهەمە پەخشانییەکان کە بە حیکایەت ناودەبرین و بەرهەمی کەسی گەورە ساڵە، کە شانەو شانی حەکایەتۆکە و پەخشانۆکەی بەرهەمی خودی منداڵانن و لە شێوە و ناوەرۆکدا، ئاژەڵ دەگرنەوە.

حیکایەتی منداڵان لە حیکایەتی گەورە ساڵان جیاوازە و هێندێک جار خولەکێک ناخایەنن و

هێمای ئاڵۆز و وشەی گران و دووفاقەکی یان تیادا بەکارناهێنرێ، لە باسکردنی شێوە و تایبەتمەندی ئاژەڵدا ڕاستی بە مەرج ناگرن، بەڵکو لە هێندێک خوو نەریتدا - وێنەی ترسنۆکی کەروێشک، فێڵبازی و زیرەکی ڕێوی، دەبەنگی و دڕەندەیی و چاوچنۆکی گورگ- بە مرۆڤیان دەچوێنن. دیارە گەورە ساڵانیش ئەم ڕێبازەیان لە حیکایەتەکانیاندا گرتوەتە بەر، بەڵام پەخشانەکانیشیان بە فۆلکلۆری منداڵان دادەنرێن. بەرچاوترین نموونەی ئەم بۆچوونەش بەرهەمەکانی د.ک.زیلیۆنینە کە لە بزن و مانگارەشە، پشیلە کلک زێڕین، ڕێوی و گورگ دەدوێن و لە حیکایەتەکانی ڕووسیای مەزن لە پارێزگای ڤیاتکەدا- و لە حیکایەتی زارۆکان-دا چڕ کراونەتەوە.

گومانی تێدا نییە پێوەندییەکی پتەو لە نێوان هونەری فۆلکلۆریی گەورە ساڵان و منداڵاندا هەیە. بەرهەمی فۆلکلۆریی گەورە ساڵان، پاش ئەوەی هێندێک لایەنی شێوە و ناوەڕۆکیان دەگۆڕدرێت و شێوە و مەبەستی نوێ هەڵدەگرن، تێکەڵ بە فۆلکلۆری منداڵان دەبن.

بۆ دیاری کردنی داهێنراوی زارەکی منداڵان دەبێت پشت بە کام سمبۆل ببەسترێت.

**یەکەم:** ئەو داهێنراوانە دەبێت لە دنیای منداڵانەوە سەریان هەڵدابێت و لە بنەڕەتدا ئەرکی جوانناسیی سایکۆلۆژی بنوێنن. واتا پێش هەموو شتێک داخوازی و حەزە جوانناسییەکانی منداڵان ئەنجام بدەن و لە هەمان کاتدا ئاکامی تێگەیشتنی منداڵ دەر ببڕن.

**دووەم:** ئەم بەرهەمانە بە پێی تایبەتمەندییەکانی سایکۆلۆژیای منداڵان و داهێنانی شیعرییان ڕۆدەنرێن.

**سێیەم:** گەلێک جار بەرهەم و داهێنراو و فۆلکلۆری منداڵان لە بەر ڕۆشنایی فۆلکلۆری گەورە ساڵاندا دانراون و تەواوی پێکهاتەی یاری کردنی لە فۆلکلۆری گەورەوە وەرگیراوە.

فۆلکلۆری منداڵان سنوورێکی دیاریکراوی نییە، ئەو بابەتانەش کە تێکەڵی فۆلکلۆری گەورەساڵان بوون بە هەمان جۆر فۆلکلۆری منداڵانیشیان گرتوەتەوە، ڤاسیلینکۆ لە وتاری - دەربارەی لێکۆڵینەوەی هاوچەرخی منداڵان - دا ئاماژە بەوە دەکات کە لە ژێر کارتێکردنی خوێندن و فێرگەدا ئەو مەتەڵ و بابەتانە پەیدا دەبن کە لە ڕووی بیرێارییەوە هۆش و بیری خوێندکاران دەوڵەمەند دەکەن"[١٢] واتە منداڵان بە نۆرەی خۆیان بەرهەمەکان وەردەگرن،





دەیلێینەوە، زیادی دەکەن و لێی دەگرنەوە.

هونەری فۆلکلۆری چۆن دەگاتە منداڵان؟ چ ئاڵوگۆڕێکیان بەسەر دێت؟ لەم پڕۆسەیەدا هونەرەکە چی لە دەست دەدات؟ هونەرەکە لە کاتی گواستنەوە چ سیفاتێکی نوێ بە دەست دەهێنێت، کاتێک بە پێی تایبەتمەنەییەکانی ئاوەزی منداڵ و داهێنانی شیعرییان دەهۆنرێتەوە؟ هەر وەکو ئەنیکین ئاماژەی پێدەکات"پێناسە کردنی ئەم بەرهەمانە بە فۆلکلۆری منداڵان، بەر لە هەڵسەنگاندنی توانستی منداڵان بۆ هەرس کردنی بابەتەکان کارێکی سانا نییە... بۆ دیاری کردن و ناساندنی بەرهەمی فۆلکلۆری منداڵان دەبێت دوو لایەن لە بەر چاو بگرین: باری دەروونی منداڵان و تەمەنیان ""[١٣] بەم مەرجەی ئەنیکین ئەم داهێنانە دەبێت لە جەرگەی جیهانی منداڵانەوە سەری هەڵدابێت. بەمەش دەگوترێت فۆلکلۆری منداڵان کە تایبەتمەندیی منداڵان دەگرێتە خۆ .

## شێوەکانی هونەر لە فۆلکلۆری منداڵانی کورددا
## ئەو بەرهەمانەی کە لە لایەن گەورە ساڵانەوە بۆ منداڵان دانراون

تاکو ئێستا فۆلکلۆری کوردی باس و توێژینەوەی ئەوتۆی لە سەر نەکراوە، کە لە داهێنراوی میللی و زارەکی منداڵان بکۆڵێتەوە و فۆلکلۆری منداڵان و بەشە هونەرییەکانی خانەبەندبکات، هەر بۆیە دید و بۆ چوونەکان لە مەڕ خودی زاراوەی فۆلکلۆری منداڵان جیاوازن! وێنەی گرەوکردن، نازناو لێنان، ناوو ناتۆرە، سترانی یاری و... هتد.

شێوەکانی یاری لە فۆلکلۆری کوردی کە دەبوو بۆ تەمەنی جیاواز بەکاربهێنرایە تێکەڵی یەکتر دەکرێن، لەم ڕووەوە ڕاو بۆچوونی زانایان لەسەر دیاریکردنی سنووری یارییەکان بە گوێرەی تەمەن جیاوازە، ئەمەش دەبێتە هۆی دروستکردنی ئاستەنگ لە ڕێگای لێکۆڵینەوە. هەر بۆیە لەم ڕووەوە ناچاربووم پشت بە تیۆری و توێژینەوەکانی زاناو لێکۆڵەرانی ڕووس لەم بوارەدا ببەستم. لەڕاستیدا هەموو نەتەوەکان لە بەراوردکردنی فۆلکلۆری گەورە ساڵان و منداڵاندا هەمان ڕێبازیان پێڕەو کردووە، بۆیە ئێمەش هەمان ڕێڕەو دەگرینە بەر و لە ئاست لێکۆڵینەوەی قۆناغەکانی تەمەنی منداڵ و باری دەروونییاندا هەڵوێستەیەک دەکەین.

شایانی باسە ئەگەرچی گەلێک بەرهەمی فۆلکلۆری منداڵان بە گشتی و بابەتەکانی بەتایبەتی هەیە، بەڵام کارێکی تایبەتمەند نین و خانە بەند نەکراون، کتێبەکەی محەمەد شەریف، -یارییەکانی کوردەواری- (١٩٧١) کە لە کەرکووک چاپ کراوە، نموونەی ئەم راستییەیە. ئەم کتێبە (١٢٠) یاری منداڵانی بەبێ دیاری کردنی هونەرەکانیان گرتووەتەخۆ و نووسەر هەر باسی یارییەکانی کردووە و لە لێکۆڵینەوەی زانستییانەیان دووری گرتووە.

نووسەر یارییەکانی لە سێ بەشدا جیا کردووەتەوە:



١) یاریی کوڕان

٢) یاریی کچان

٣) یاریی گشتی و هاوبەش

کتێبی -یاریی وەرزشی نەتەوەی کورد- کە لە لایەن سالح عەلی سالحەوە نووسراوە و ساڵی ١٩٧٤ لە سلێمانی بڵاو کراوەتەوە و هیچ جۆرە خانەبەندییەک یان شیکردنەوەیەکی زانستیانەی دیاری نەکردووە، بە هەمان سەرئەنجامان دەگەیەنێت، سەرجەمی ئەو وتار و بابەتانەش کە لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و عەرەبییەکاندا دەربارەی ئەم بابەتە بڵاو کراونەتەوە، لەو دوو کتێبەی کە ئاماژەمان بۆ کردن تێنەپەڕیوە.

ئێمە لە فۆلکلۆری منداڵان دەکۆڵینەوە، ئەو بابەتانەی لە بەر دەستماندان و پشتمان پێ بەستوون و لەبەر چاویان دەگرین و لە ئاکامی شیکردنەوەی دەقەکاندا، سەرنج لە سنووری هونەرە بنچینەییەکانی داهێنانی زارەکی منداڵانی کورد بەجیادەگرین و لە بەر ڕۆشنایی ئاکامەکەشیدا ئەم خانەبەندییەی خوارەوە پێشنیار دەکەین. مەبەست لە فۆلکلۆری منداڵانی کورد ئەو بەرهەم و داهێنراوە میللی و سەرزارەکییانەیە، هەروەها ئەو داهێنراوانەی گەورە ساڵان کە بۆ منداڵان دانراون، بە داهێنراوی خودی منداڵان خۆیانەوە.

هەڵبەستی دایکان کە پانتاییەکی بەر فراوان دەگرێتەوە، لە هونەری لایلایە، هێور کردنەوە (لوری). خلافاندن، مەتەڵ، یاری و حیکایەت پێکدێت، لایلایە و لوری لەو شێوە ئاواز و ناوەڕۆکانەن کە منداڵ بە کۆرپەیی گوێی لێیان دەبێت و سترانی پێدا هەڵدەدەن، خلافاندن و ئەو کورتە حیکایەتانەش کە بە چیرۆک ناو دەبرێن هەر وەک ئەو لایلایە و لوربیانە بە یەک ئاوازە و دەنگ دەوترێن و بە مەبەستی خەواندنی منداڵانە.

لایلایە و لوری یارمەتی منداڵان دەدەن گوێیان بە ئاواز و دەنگ ڕابهێنن و فێری گوێگرتن و سەرنجدانیان دەکەن، لایلایە جێگایەکی بەرچاوی هەیە، منداڵی ساوا ئاشنای لایلایە و سترانی لاواندنەوەو هێورکردنەوە دەبێت و لە کۆرپەییەوە دەست بە جۆرە ئاوازی گڕوگاڵ دەکات و فێری چەپڵە لێدان دەبێت، بەم پێیە فێری ئاواز و جووڵەیەکی تایبەت دەبێت و هەر لەم تەمەنەشدا لە گەڵ هەڵدان و هەڵپەرکێ ئاشنا دەبێت.





ئەگەرچی منداڵی ساوا دەقی لایلایەکان تێناگات، بەڵام دەنگ و ئاوازی لایلایەکان سەرنجی ڕادەکێشێ و هۆگریان دەبێت. ئاواز و مۆسیقای ساکار و سترانی نەرم و لە سەر خۆ کار دەکاتە سەر منداڵ و هێوری دەکاتەوە و سەرنجی ڕادەکێشێت و هۆگری گوێڕادانی دەکات. ئەم کارەش لە تێگەیشتنی وشە و دەنگە مانا هەڵگرەکاندا یارمەتییان دەدات، تەنانەت منداڵی نۆمانگانیش دەنگی: ما ما، دا دا، نا نا،با با ولە پێنج مانگانیشەوە ئا ئا، با با، نا...نا بە مەبەستی لاسایی کردنەوە یان بۆ داخوازی دەربڕین و کڕوزانەوە و هێندێک جاریش بە هێمنییەکی سەرنج ڕاکێشەوە دەیلێتەوە، ئەم دەنگانەش ئاکامی لاسایی کردنەوەی (ئۆ لۆ لایلایە ڕۆڵە لایلایە )، کە دەورێکی گەورەی لە بوژاندنەوەی فیزیکی منداڵدا دەبێت و هێوری دەکاتەوە و بەرە بەرە لە بێدارییەوە بە وەنەوزدان، دەیخەوێنێت.

لایللایە و لوری دەکرێن بە چەند بەشێکەوە:

١-گۆرانی ئاراستەکراو بۆ منداڵی کۆرپە:

لەم چەشنە سترانەدا هیوا و ئاوات، بۆ خۆشبەختی و جوانی و جوامێری و هێز و بازووی پتە و سوارچاکی و نیشان شکێنی و تیر ئەندازی تێدا بەرجەستە دەبێت، ئەم سترانانە بە پێی ڕەگەزی منداڵەکە، لە کوڕەوە بۆ کچ، بە پێی پێگەی کۆمەڵایەتی دەگۆڕێت.

٢- لایلایە و لوری: ئەم چەشنە ناوەڕۆکەکانیان پتر بە خوێندن و گەرم و گوڕی گۆرانیبێژەکەوە بەندە.

٣- ئەو لایلایە و گۆرانییانەی کە ناوەڕۆکی پێکەنیناوییان هەیە و بۆ منداڵی تەمەن ساڵ و نیوی تا دوو ساڵ تەرخانن، کە لەم تەمەنەدا منداڵان لە ناوەڕۆکی گۆرانییەکان دەگەن.

ئەو ئافرەتانەی لوری و لایلایە بۆ منداڵەکانیان دەڵێن بە زۆری دایک و دایەن و داپیرە و خوشکە گەورەی منداڵەکانن و بە زمانێکی سادە و ساکار، بیروڕا و هەستی خۆیان دەردەبڕن. ئەو لای لایانە کێشێکی نیمچە شیعری و پەخشان ئامێزیان هەیە و هێندێکیشیان لە خانەی شیعردا ڕیزبەند دەکرێن.

ناوەڕۆکی ئەم لایلایە و لوریانە جیاوازن. مەبەستی سەرەکیش هێور کردنەوەی منداڵە و خەواندنی، بۆ نموونە:





ڕۆڵەی شیرینم جگەر گۆشەکەم
مەڵهەمی زامی بە پەرۆشەکەم
شیرە پاکەکەت نەخۆی بە درۆ
سەرسەری نەبی نەمکەی ڕەنجەڕۆ

لایلایەکەت بۆ بکەم بە کورد زوبانی
یاخوا تۆ نەمری بە نەوجوانی
بووم بە ئاسکەکەی توێی جەبەڵان
شین و زاریمە لە شوێن وەڵەدان
نە دایەم مەردە نە باوەم مەردە
بووم بە حەیرانەکەی وڵات گوم کەردە

لایلایە و لوری لە هونەری بەراوردا کەڵک لە سروشت و جوانییەکانی وەردەگرێت. لەم دەقەی سەرەوەدا دایک خۆشەویستی بێ پایانی خۆی بۆ منداڵەکەی دەردەبڕێت، ئاواتە خوازە ئەو ڕەنجەی کە لەگەڵ منداڵەکەی داویەتی بە فیڕۆ نەچێ. لەم چەشنە گۆرانییانەدا، کێش و قافیە و دووپاتکردنەوە و پێکهاتەی گۆشەکان کە بە مۆنۆگرام ناو دەبرێت- شێوەیەکی هونەریی زۆر کۆن نییەو لە مەولودنامە و بانگهێشت و بۆنە جۆراو جۆرەکاندا دەبینرێت، زۆر جار ڕووداوەکانی ئەو لایلایە و لورییانە ئازار و ئێشی واقعییانەیە کە لوریبێژ دەریان دەبڕێت. هەروەکوو کاپیتسا دەڵێت:"ماوەیەکی درێژ خایەن ئافرەتانی ڕۆژهەڵات کۆیلەی نێوخێزان وکزەڵۆک بوون. دایک سترانی جۆراوجۆری بۆ کچە کۆرپەکەی یا خۆد کوڕەکەی دەگوت، کوڕ بە کۆڵەکەی خێزان و ئاواتی دایک و سەربەرزیی باوک ناو دەبرا، بەڵام کچ بە پەژارەی باوک و سەر کزڵەیی دایک" "١٤"

لایلایە لە پێوەندی پتەوی ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵکەوە سەر هەڵدەدات، تۆڵستۆی گوتەنی:" ئەگەر بناغەی کارێک تێ بگەیت، بەشەکانی سەر بناغەکەت ڕوونتر دەبیت و تۆڕی سایکۆلۆژیای مروڤ تێدەگەیت، ئاستەمە مرۆڤ لە لایلایە دێرینەکان چێژ وەر بگرێت، یان کاری تێکەن ئەگەر شارەزای ماڵە جوتیاری کوخ نشین نەبیت و ژنە جۆتیاری بەر ئاگردان نەبینێت، کە

لە سەرێکەوە بەدەم تەشی رستنەوە، لانکە بە پێیەک رادە ژێنێت و زریان بە سەر ماڵە نوغرۆکەیدا هەڵدەکات، لە سەرێکی دیکەوە سیسرکێک گاز لە منداڵەکەی دەگرێت، تەنیا رووناکی ژیانیشی ئەو تروسکە کزەیە کە لە سەرە بزووتی ئاکامی ڕەژوو هەڵدێت، هەرچی هێما و بزووتنەوەکانی ناوەوەی لایلایەیە، لەم راستیانەوە سەر هەڵ دەدەن ".[١٥]"

لایلایەی کوردی لە بنەڕەتدا بۆ هەرەتی ساوایەتی، لە ساڵێکەوە تا سێ ساڵ دەگەرێتەوە، بەڵام بۆ تەمەنی سەرووتریش دەگوترێت، کە وشەو هۆنراوەی ساکاری بۆ زیاد دەکرێت، بەونیازەی بۆ هەڵدانی گورج و شادمانیی منداڵەکە مایە بێت، یان بۆ ئەوەی لایلایەکە بلێتەوە، بۆ نموونە ئەو دەمانەی کەمنداڵەکە لە خەو ڕادەبێت و هەڵی دەدەنەوە و دەڵێن:

ئاخچی و بوخچی، نەنەو بەبە سنوقچی سترانی خافڵاندن و پێداهەڵگوتن و لوری جۆرێکی تایبەتی (هۆنراوەی دایکان) پێک دەهێنن و زۆر بابەت لە لایلایەدا بۆ منداڵی بە تەمەنتریش وتراون بە فۆلکلۆری منداڵان دادەنرێت، ناوەرۆکی ئەو گۆرانیانە گەلێک بابەتی دڵگیر و خۆش دەخاتە روو، پێویستە دایک و باوکان منداڵانیان لە قۆناغە سەرەتاییەکانی ژیانیاندا بە هێندێک قسەو لاسایی کردنەوە و بابەتی نەریت ئامێزەوە، بە مەبەستی خافڵاندن و دڵخۆش کردن رابهێنن، ڤینۆگرادوف گۆرانی خلافاندن و ناوو ناتۆرە، بەو چیرۆکە شیعرە ناو دەبا کە پێکهێنەری جۆرێکە لە هونەری فۆلکلۆری منداڵان کە سەرەڕای ئەرکە سایکۆلۆژییە جوانناسییەکانی، هێندێک ئەرکی وەرزشی بۆ منداڵ بە جێ دەهێنێت، لای کوردیش گۆرانی لوری بە پەنابردنە بەر پەنجە و دەست و پێ گەلێک یاری ساکار ئەنجام دەدرێت، نموونەی ئەم دیمەنەی لە گۆرانی چۆلەکەدا دەبینین:

چۆلەکەیەک هاتە سەر چە چە
هێلکەیەکی کردە ئەو چەچە
ئەوە ئاگری هێنا
ئەوە برژاندی
ئەوە پاکی کرد
ئەوە خواردی





ئەوە وتی کوا بەشی من؟

ئاوازی گۆرانی پێدا گوتن و لوری و رووداوەکانیان بە ناو دێن و خێرا کۆتاییان دێت، بەڵام فاکتەرەکانی ژیانیش دووپاتدەکەنەوە، جاری وا هەیە پێکهاتەی ئەم گۆرانیانە منداڵ دەخاتە سەر کەڵکەڵەی نیگار کێشان، کە هاوتاکەی لە ئەدەبی رووسیشدا بە دی دەکرێت، ئەم گۆرانیانە نموونەی گۆرانییەکانی (لادوشکی و سەرۆکە) گەلێک جار تایبەتمەندییە سایکۆلۆژییەکانی منداڵ لە رێگەی دیمەنەوێنەی سروشتییەوە دیار دەخەن و لەوێشەوە چەندین بیری گەورە ساڵان –لە بارەی ئاکار و رەوشتی پەسەند و کاری کردەنییەوە– بە منداڵ دەگەیەنن: قەلەکە شۆربا بە منداڵەکە نادات چونکە لەئاو هێنان و چیلەکردندا بۆ شۆربا لێنان یارمەتی نەدا.

لوری و لایلایەی کوردی زیاتر بۆ منداڵی یەک تا یەک ساڵ و نیو دەگوترێ، کە لە رێگەیانەوە هێندێک بۆچونی پەروەردەکردنی میللی و بیری ساکار بە منداڵ دەگەیەنرێن،لەم تەمەنەدا گرنگترین لایەن بۆ منداڵ دەربڕینی ریتم و پێوەندی دەنگی نێوان وشەکانە، ئەم جۆرە هونەرەش بە جۆرێکی وەها بەرفراوان لە نێو خەلکدا بلاو بووەتەوە، سیمایەکی میللی وەرگرتوە، هۆی ئەم بەرفراوانییەش ئاوازە روون و لایەنە کاریگەرەکەیەتی، سەرنج بدەن، کە دایک دەستی منداڵ دەگرێت و ناوی پەنجەکانی پێ دەڵێت:

توتە، براتوتە، بەرزە لوتە، دۆشاو مژە، ئەسپێ کوژە .

گۆرانی پێدا گوتن و نازناوی کوردی،کە بە گۆرانی (خافڵکردن) ناو دەبرێن، باس لە تەواوی ژیانی منداڵ: گاگۆڵکێ کردن و پێگرتن و پەل راوەشاندن وتل خواردنەوە تا قۆناغی دیکە، دەکات . بۆیە لە کوردەواریدا منداڵ پاش ئەوەی لە خەو ڕادەبێت دەستراژەکەی دەکەنەوە و بە دەم دەست و پێ وەجوولە خستنییەوە، هێندێک گۆرانی بۆ دەڵێن کە مانایەکی گرنگی ئەوتۆیان نییە، بەڵام کەڵک لە ئاوازە خۆشەکانیان وەردەگیرێت:

کوڕەکەم هەستا لە خەوێ
گۆشتی عەلەشیشی دەوێ

یان کە منداڵ سەر پێ دەکەوێت و دەکەوێتە پێڕەوکە هەر دوو دەستی دەگرن و بۆی دەڵێن:

تاتی تاتی یا خوا بەخێر هاتی

یان " داره داره پێ بگره بەهاره"

دوو جۆرە شیعری خلافاندن هەن کە بە شێکیان زیاتر ئاواز و مۆسیقای وشەکان منداڵان دڵخۆش دەکەن و بە سەماو هەڵپەڕکێیان دەخەن. لەم جۆرەیاندا مەرج نییە ناوەڕۆکی گۆرانیەکان پڕ ماناو وشەی پێزدار بێت، چونکە ئەم جۆرە گۆرانیانە بۆ ئەو منداڵانە دەوترێت کە توانای تێگەیشتنی ناوەڕۆکیان نییە. جۆری دووەمی ئەم چەشنە گۆرانیە بۆ منداڵی گەورەتر دەوترێت، لێرەدا بایەخ بە ناوەڕۆک دەدرێ و بە مەبەستی ئاراستەکردن دەوترێ. لە فۆلکلۆری منداڵانی کوردا زۆرجار ئەو بەرهەمانەمان بەرچاو دەکەوێت کە دەکرێ بە گۆرانی ویژدانی و بە بابەتی خلافاندن و پیاهەڵدان ناوبرێت.

ئەم بەرهەمانەش زیاتر وەڵامی حەز و ئارەزووەکانی تەمەنێکی دیاریکراوی منداڵان دەدەنەوە، بە زۆری ئەو گۆرانیانەی کە داپیرە و دایکان بۆ پیاهەڵدانی مندال دەیڵێنەوە:

لەبەری مرم هەنیشێ

تۆز لە باڵای نەنیشێ

نینی نینی وای ئەوێ

بێشکەی بەرەو بای ئەوێ.

کوڕی دەس بەغای ئەوێ ( ئەگەر منداڵەکە کوڕ بێت)

کچی دەس بەغای ئەوێ( ئەگەر منداڵەکە کچ بێت)

نینی نینی داوای پاوانەی زیو دەکا

باوکی خۆش بێت بۆی دەکا

نینی نینی نیناوا بێنی پای کەژاوا بۆ حاکمی ڕۆژئاوا

هەرچی کچێکی وای هەیە    حەوت باغچە خورمای هەیە

دایە لە دەوری گەڕێ    هەرچی ماڵە بۆی بگەڕێ

ماڵەکان ڕەحمەت لێتان    ئەو کوڕە لە ماڵی کێتان





ئازاد ئازاد بوێژن

کەوتوەتە تەک برێ ژن

هەمووی پۆیلە درێژن

دووربێت ئازاد نەکوژن

ئاشکرایە گۆرانی (خلافاندن)، کە بە وشەی مانابەخش و ئاوازی جوانەوە دەردەبڕدرێن و دایکان دەیانهۆننەوە و  بە شیعری دایکان ناودەبرێن، هەر بۆ خلافاندنی منداڵ نییە بەڵکو لایەنی جوانناسی، ڕۆحی و فیزیکیشی تێدایە.

ئەگەر بەم شێوەیە و بە گەواهیدانی ف.پ.ئەنیکینیشەوە ناوەرۆکی ئەم لاوژانە بە پێی تەمەنی منداڵ دەگۆڕێت و پێوەندییەکی ئەوتۆیان بە یارییەکی تایبەتییەوە نییە، بۆیە پێویستە ئەو وشە و ناوەڕۆکانە پێکیان بهێنن کە توانستی سەرنجڕاکێشانی منداڵیان هەیە. لێرەوە دەتوانین بڵێین دوو جۆر گۆرانی شیعریی خلافاندن هەن:

١) ئاوازو ناوەرۆکەکەی خۆشی بە منداڵ دەبەخشن و بە سەما و هەڵپەرکێیان دەخەن، کە مەرج نییە مانای بە پێزبگرێتە خۆ، چونکە بۆ منداڵێک دەگوترێن کە هێشتا توانستی تێگەیشتنی لە مێشکدا نەزاوە.

٢) بۆ منداڵی بە تەمەنتر دەگوترێن و تێیدا بایەخ بە ناوەرۆک دەدرێت و ڕێی شیاوی منداڵ دەستنیشان دەکەن، لە فۆلکلۆری منداڵانی کوردا زۆر جار ئەو بەرهەمانەمان بەر چاو دەکەون کە دەشێت بە گۆرانی ویژدانی و بابەتی خلافاندن و پێدا گوتن ناو ببرێن، ئەم هونەرە وەڵامدەری حەز و ئارەزووی منداڵانە لە تەمەنێکی دیاری کراودا و لەو گۆرانییانە پێک دێت کە دایک و داپیران بە باڵای منداڵاندا دەیانڵێنەوە.

ئەو گۆرانییانەی لە ڕووی مانا و ناوەرۆکەوە دەوڵەمەندترن و بۆ ئەو منداڵانە دەگوترێن کەلێیان تێدەگەن، بەڵام منداڵی ساوا زیاتر دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو لاوژانەوە کە بە دەنگ و ئاوازەوە دەگوترێن.

ئەم لاوەژانە گەلێک جار ڕووداوێکی کورتخایەن بە ناو دەخەنە ڕوو. ئەگەر چیش بابەت و شێوەی جۆرا و جۆر دەگرنە خۆ، بەلاّم هێندێک بابەتی نائاسایی و ئەفسانەئامێزیش دەردەبڕن، کە مەیلی گاڵتە کردن و پێکەنین تێدا دەخەنەڕوو لێرەشدا چەند نموونەیەک دەهێنینەوە:

بەرخەنان و بەرخەدۆ

بەرخەوانی بەکرەجۆ

هەستە بەپێی خۆت برۆ

شلە کونەم جوانە گۆشتی ولـمەی ڕانە

نەرمەی بێ ئێسقانە پەستەک لەبەرم جوانە

کچەکان مەچن بۆ ناو دار

کوڕم شێتە کلاّو لار

لێتان ئەکا سەربەرەوخوار

هەرچی کچم نەلاوێنێ کەرەی بەهار نەتاوێنێ

هەرچی کچەکەم بانگ نەکا خەلە لە خەرمان نەکا

ماڵی جارێ نان نەکا

هەرچی کچەکەم نەگرێ بەیار

مانگای بمرێ لە تەڕی بەهار

مەشکەی وشک کا بیکا بەدار

ئەدەبی منداڵانی کورد ژمارەیەک زۆر شێوە و جۆری ئەو بەرهەمانەی سەرەوە دەگرێتەوە.

## رازوو مەتەڵ و خێرا وتن





منداڵ چەند گەورە بێت حەزو داوا و پێویستیەکانی لە رازو مەتەڵ و خێرا وتن و خلاّفاندندا پتر دەبێ. پێویستی بە دیدو بۆچوونی نوێ و شارەزایی دەوروبەری دەبێت. ئەو بابەتانەش کە ئەم بەرهەمانە دەیان گرنەخۆیان زیاتر لە دیاردەکانی ژیان و لە ڕاستیی تێگەیشتنی منداڵانەوە نزیک دەبێتەوە.

کەسانی گەورە بە لێکدانەوەی خۆیان و بە پێی زانیاری و توانایانەوە دەچنە دنیای منداڵ و دیاردەکانی ناو ئەم جیهانەوە. هەندێ لەم دیاردانەش مەیلێکی ڕۆمانسییانەیان تیایە بۆ نموونە منداڵ لە بیدەنگی شەودا، پێش ئەوەی کە خەویان لێ بکەوێ، گوێیان لە دەنگی هەندێ باڵدار دەبێ، بۆ نموونە: وەکوو قاغ قاغ - کڕ کڕ - جو جو جو...هتد، ئەم دەنگە نامۆ و تازانە خۆشن، بە تایبەتی کە جاری دووەمیان دەنگەکە بە شێوەیەکی جیاواز لە جاری یەکەم دێتە بەر گوێی، وا لە منالّەکە دەکا بپرسێ ئەوە کێیە هاوار دەکا، لەم کاتەدا کەسانی گەورە، حیکایەت و مەتەڵی ئاراستە کراو و پەروەردە کار بۆ منداڵەکە دەڵێن کە پەیوەندی بەو ئاژەڵ و دەنگانەوە هەیە.

لە حیکایەت و فۆلکلۆری کوردیش دا گەلێک لەم بابەتانە هەن وەک (تیتیلە و بیبیلە)، ئەم حیکایەت و مەتەلاّنە گەلێک بە تام و چێژن و منداڵان زۆر حەزیان لێ دەکەن و هەمیشە داوا دەکەن بۆیان بگێڕدرێتەوە، پاشان خۆیان شتی تری دەخەنە سەر و دەیگێڕنەوە، بۆ نموونە وەک حیکایەتی (مەڕ و بزن) کە گەلێ لایەنی پەروەردەیی تیایە، کاتێ کە بزنەکە لە وەختی داهاتنی زستان، دەیەوێ ماڵێک بۆ خۆی دروست بکات، داوا لە مەڕەکە دەکا کە یارمەتی بدات لە دروستکردنی ئەم ماڵە هاوبەشەدا، بەلاّم مەڕەکە لە وەلاّمدا دەڵێت من نامەوێ کار بکەم و پێویستم بە ماڵیش نییە.

لە ڕۆژێکی ساردی زستان دا، مەڕەکە زۆر سەرمای دەبێت، دێتە لای بزنەکە و داوای لێدەکات کە جێی بکاتەوە و لەو سەرمایە رزگاری بکات، بەلاّم بزنەکە ڕازی نابێت و دەری دەکات.

بۆ بەیانی بزنەکە کاتێک دەرگا دەکاتەوە، دەبینێ مەڕەکە لە سەرما، لە پاڵ دەرگاکەدا رەق بووەتەوە.

حیکایەت زیاتر لە سەر پرسیارو وەلاّم و دیالۆگ پێک دێ و کە منداڵان زۆر حەز لەم چەشنە

بەرهەمانە دەکەن. لەمەش دا ئەوە دەردەکەوێ کە پەیوەندی لە نێوان ڕوخسارو یاری دراماتیکی دا هەیە، هەروا پەیوەندی لە نێوان حیکایەتی پرسیار و وەڵام حەز و ئارەزووی منداڵ بۆ فێر بوونی زیاتر و هەمیشە پرسیار کردن هەیە، وەک (بۆچی)، (بە چ مەبەستێک )، (چی) (چۆن)، لە هەمان کاتدا حیکایەت منداڵ بە گیانی دادپەروەری و مرۆڤایەتی و یەکسانی، پەروەردە دەکات.

جیهانی منداڵ پڕە لە شادی و خۆشی و یاری و خەیاڵی سەیر سەیر و داهێنانی جۆر بە جۆر هەروەها گەورەش هەموو کاتێک شیعر یان گۆرانی خلافاندنی لا دەست ئەکەوێت بۆ منداڵ، وەک ئەم نموونەیەی خوارەوە:

رۆڤی رۆڤی رندکو
سەری خۆ کندکێ
رۆڤی داوە تێ خو دەکا
دوژمنی مروتازە
رۆڤە بونە زۆر ناچی
ناردنە ماڵ ئاسنگەرا
سێ رۆژ پرچی کرنا
رۆژی چوارەم تەواو بو
کولانەی مریشکان بەتاڵ بو "١٦"

منداڵەکان دەستی یەک دەگرن لە ئەڵقەیەکدا دەوەستن و بە دەم چەپڵە لێدانەوە گۆرانی رۆڤی رۆڤی دەڵێن. گەورەکان لەم رێگایەوە هەوڵدەدەن گیانی فێر بوون و زیرەکی و بەهرە و داهێنان لای منداڵەکانیان بخولقێنن.

مەتەڵ و خێرا وتن یارمەتی سەر هەڵدان و بوژاندنەوەی ئەم سیفەتانەی داوە، خێرا وتن لە فۆلکلۆری کوردی دا فۆنەتیکێکی قورسی هەیە. منداڵان دەخاتە کێبرکێیەوە بۆ ئەوەی دەرکەوێ کێ دەتوانێ بەبێ هەڵەو بە خێرایی بیڵێتەوە. ئەمەش یارمەتی منداڵ دەدا بۆ ئەوەی زووتر لە گەڵ فۆنەتیکی زمان دا رابێت و بە خێرایی و چاکی بتوانێ وشە قورسەکان بە کار بهێنێ. بۆ نموونە:





چومە چەمی چەقان   چەقەڵ چەڵتووکی ئەتەقان.

مەری لەڕ لە لارێ ئەلەوەرێ

شەش سەدوو شەست و شەش شووتی سەوز.

## هەڵهێنان و مەتەڵ

هەڵهێنان و مەتەڵ بایەخێکی زۆریان هەیە بۆ دەرک پەیداکردنی منداڵ. چونکە ناوەرۆکی ئەو مەتەڵانە دەربارەی بارو دۆخی ژیانە. چیرۆک و مەتەڵ وا لە منداڵان دەکەن بە زیرەکی لە دیاردە و شتەکانی ژیان تێبگەن و لە پەیوەندی نێوانیان حاڵی بن. چونکە بە کار هێنانی دەرک کردن لە مەتەڵ هەڵهێنان لە هەست و نەستی منداڵەوە نزیکە.

لەم جۆرە مەتەڵانەدا وەڵامی پرسیاری منداڵان دەدرێتەوە ومێشکیان زاخاوی دەدرێ، مەودای بیرکردنەوەیان فراوانتر دەکات. مکسیم گۆرکی دەڵێ "هەڵهێنانی ئەم جۆرە مەتەڵانە بە جۆرە مەشق و راهێنانێک دادەنرێ بۆ مێشک و زیرەکی منداڵ، یاخود (مەشقی مێشک)"١٧"

مەتەڵی منداڵان لە رووخسار و ناوەرۆکدا لە هەست و هۆشمەندی ئەوانەوە نزیکە و لەو مەتەڵانەدا هەندێ شت و دیاردە بەر چاو دەکەون کە منداڵان رۆژانە مامەڵەیان لە گەڵدا دەکەن.

مەتەڵ بۆ سەرنج راکێشانی منداڵان و بەهرەی تێبینی کردن بە کار دێت لە رێگەی ئاماژە کردن بە شتێک، یان دیاردەیەک. بۆ نموونە:

هەر لێرەوە هەتا مەکە هەمووی کیژی چاو بەڵەکە
هەلە  فتەر  مەلە فتەر   کورە ژ باقی بلند تر
ئاشە   ئاشە  چوار  فەراشە  دوو پێشە  دوو پاشە

کەسانی زەحمەت کێش وەختی ئەوەیان نییە کە بەشێکی زۆری کاتیان بۆ

بایەخدان و پەروەردەکردنی منداڵەکانیان تەرخان بکەن، بۆیە ناچارن لە کاتی بار کردن یان لە وەختی پشوودا مەتەڵ و حیکایەت و شیعر بۆ منداڵەکانیان بڵێن.

جۆرێکی تر لە فۆلکلۆری منداڵ ئەو جۆرە هۆنراوەیە بە هۆنراوەی زیادەڕۆیی و فیشاڵ ناسراون.

لە ئینگلستان بەم جۆرە شیعرە لە فۆلکلۆری منداڵاندا دەڵێن (شیعری لنگەو قووچ کراوە) چوکۆڤسکی ئەم زاراوەیەی هێناوەتەوە ناو زمانی ڕووسییەوە. (شیعری لنگەو قووچ کراو) بۆ یەکەم جار لە لایەن چوکۆڤسکی یەوە لە ئەدەبی رووسیدا بە کار هێنرا."١٨"

ئەم جۆرە هونەرە کە ماوەیەکی زۆر نییە سەری هەڵداوە ناتوانین بڵێین کە لە فۆلکلۆری منداڵانی کورددا هەیە چۆنکە هیچ تێکستێکمان لە بەر دەستدا نی یە کە ئاماژە بۆ ئەم مەسەلەیە بدات.

چۆکۆڤسکی تەنیا ئەم زاراوە زانستییەی نەدۆزییەوە و بەس، بەڵکو چەند نموونەیەکیش لەم جۆرە شیعرەی لە ئینگلیزیەوە گۆریوەتە سەر زمانی ڕووسی (جێنی، مریشکە، ئازا) ئەم جۆرە بەرهەمانە ڕۆڵێکی گەورە لە پەروەردەکردنی میللییانەی منداڵاندا دەگێڕن و مێشکی نەوەیەکی ڕووخۆش و ساغ و شادمان زاخاو دەدا، ئەم بەرهەمە شیعرییانە لە ناو گەلاندا بڵاو بوونەتەوە ئەگەرچی لە بنچینەدا هەندێ ڕووخساری هاوبەشیان هەیە، بەڵام سیماو خاسیەتی تایبەت بە خۆشیان هەیە.

جەوهەری ئەم هۆنراوە لنگەو قووچ کراوانە و گۆرانی درۆ لەوەدا دەردەکەوێ کە هەندێ سیماو ئەرک لە شتێکەوە بۆ شتێکی تر دەگوازنەوە، تەنانەت ئەو هونەرمەندانەش کە ئەم گۆرانیانە دەڵێن بە فشقیات ناوی دەبەن.

"برایان ڕێگام بدەن گۆرانی درۆتان بۆ بڵێم، درۆ و فشقیات"

لەم جۆرە گۆرانیانەدا ئاژەڵ ڕۆڵی مرۆڤ دەبینن. بزن بەروانکە لە بەر دەکا و مریشک پێڵاوو مراوی کراسی لەبەردایە،... هتد

ئاژەڵەکان هەموو ئەو کارانە ئەنجام ئەدەن، کە مرۆڤ دەیکات، مریشک ماڵ گسک ئەدا و پشیلە نان دەبرژێنێ و جل دەدورێ، لە هەمان کاتدا سیفاتی هەندی ئاژەڵ دەدرێتە پاڵ یەکتر،





ورچ بە ئاسماندا دەفڕێ و گوێچکەو کلکی دەلەقێنێ، سەگ گوێرەکەی بوو، بەرازە بچووکەکە هێلکەی کرد، خەڵک کارو کردەوەی نائاساییی جێ بە جێ دەکەن: جوتیاران لە سەر جادەکە چەپەرێک دروست دەکەن بو ڕاوە ماسی. "فۆم"بە سواری مریشک دەروات و "تیمۆشکاش" بە سواری پشیلە دەڕوات، جۆتیار بە مێشوولە ئەرز دەکێڵێ.

جیهانی ئەم بابەتانە هەموو یاساکانی ژیان تێدەپەڕێنن و چۆکۆڤسکی گاڵتەجاری هونەری درۆی منداڵان لە وتارێکدا بە ناوونیشانی"درۆی دارستانەکە" ئاماژە بە درۆ باوەکان دەکات کە لە فۆلکلۆری ئینگلیزی و ڕووسیدا هەن و هەوڵ دەدا نرخ و بایەخی پەروەردەییانەی ئەم درۆیانە بسەلمێنێ. ئەمەش بە هۆی لادان لە وێنەی ڕاستەقینەی شتەکانە کە دەبێتە هۆی پێکەنینی منداڵان، چەندیش ئەم لادان و سەرپێچی کردنە زیادبکات هەستی خلافاندن زۆر تر دەبێت. هەرلادان و پێشێل کردنێکی دیاردە مەعقولەکان متمانەی منداڵ بەڕاستی ئەو دیاردانە زیاتر دەکات.

منداڵان لەم درۆیانەدا شتە ئاساییەکان دەبینن و بە وردی تێیان دەگەن، واتە بە هیچ جۆرێ هەستی بینینی وێنە واقعیانەکان لە دەست نادەن، پەیوەندی زنجیرەیی شتەکان کە بە دوای یەک دا دێن بەتوندی سەرنجی منداڵان رادەکێشن و حەز کردن بە پاراستنی ئەو پەیوەندییە زنجیرەییە لای منداڵان زەق دەبێتەوە و حیکایەتی درۆی کوردی وەک ڕێوی و شەیتان تەنیا لە جیهانی منداڵەوە نزێک نییە بەڵکۆ زیرەکی و لیاقەتیشیان نەشوو نەما پێ دەکا.

ئەو منداڵانەی کە بە شێوەیەکی ئاسایی نەشونەمادەکەن لە ناو کەش و هەوای جیهانی فۆلکلۆردا گەورە دەبن، هەمیشە گەش بین، لێکۆڵینەوەی ئەم جۆرە فۆلکلۆرە دەمانگەیەنێتە ئەو ڕاستیەی کە پێکەنین لایەنێکی سەرەکی بابەتی گاڵتە و خەلافاندنە

## حیکایەت

یەکێکە لە هونەرە میللییە ناسراوەکان. داهێنانێکی سەرزارەکی میللی کوردییە. هونەرێکی داستان و پەخشان ئامێزە و پەرەگرتنی ڕووداوەکان ڕەنگ پێدەداتەوە، دەگێردرێتەوە بە پێچەوانەی گۆرانییەوە. بابەتی ئەم حیکایەت و ڕازانە لە ڕووداوی سەرنج ڕاکێش و ئاسایی

دەدوێن. هەندێک جـار ڕووداوی فـرە ترسناک یان فـرە دڵخـۆشکەرە. ئەم ڕووداوانە جـۆرە سروشتێکی سەر چڵانە دەگرنە خۆ.

ئەم جۆرە حیکایەتانە کۆتاییـەکەیان بەختـەوەرانە تەواو دەبێ و هەمـوو شتـێ سـەبارەت بە کەسایەتی سەرەکی و چارە نووسییـەتی، حیکایەت بەوە دەناسرێتەوە کە فۆرمێکی دەسنیـشان کـراوی هەیە و ڕەگـەزەکـانی هەر دەم جـێگرن و چەند سـاتێکی پێـویست هەن کـە دەبێ لە هەر حیکایەتێکدا هەبێ، هەر وەها لە حیکایەتدا باسی سروشت و ژینگە ناکرێت و ڕووداوەکـان بە ڕووتی بەبـێ وەسف و درێژدادری دەخـــرێنە ڕوو، ئەویـش لە بەر ئەوەیـە منداڵ حـــەزی لە درێژکردنەوەی گێرانەوەی ڕووداوەکان نییە.

حیکایەت وەک (قەسیدەی مەلحەمی) ئەو توخمانەی تیا نییە کە ڕەوتی بە سەرهاتەکە هێور دەکەنەوە، بەڵام هەردەم بەوە دەناسرێتەوە خەسڵەتمەندی پێکهێنەرە هەمیـشەییـەکان و سەرەتا و کۆتایی و دووبارە بوونەوەی گرتە (لقطە) کان، سێ پلەی دروستکردنی سوژێت و بە کار هێنانی کەسان و گیانەوەر و شمەکی ئەوتۆی تێدان کە ئەفسانەیین و یارمەتی پاڵەوانی سەرەکی دەدەن کە بگاتە ئامانجی کۆتایی.

لە حیکایەتدا هەر دەم بە سەرهات و کەسایەتی خەیاڵی و دروست کراو دەخرێنە پێش چاو کە هەندێ کات تا ڕادەیەک بە شێوەیەکی واقیعانە پێشکەش دەکرێن و کاتی واش هەیە تا ڕادەیەکی زۆر لە ڕاستـییـەوە دوورن. حیکایەت سـەرباری ڕۆڵـی گـرنگ و دیاری، خـەیاڵ تێیـدا هەردەم بنەچەو بناغـەیەکی پێکهاتەکەیەتی. لە حیکایەتدا و لە چوار چێوە و فۆرمێکی تایبەتدا واقیع دەخرێتە ڕوو. هەروا باس لە ئاوات و هیوای داهاتووی نەتەوە بکرێت.

مـەکسیم گـۆرکی سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشـا کە لە حیکایەتدا، خەون و ئارەزووەکانی گەل بە ژیانێکی باشترەوە بەرجەستە دەبن، دەڵێ:" هەر لە سەر دەمە هەرە کۆنەکانەوە خەڵکی خەویان بەوەوە دیوە کە بتوانن بفڕن - بەڵگەشمان بۆ ئەمە داستانەکانی فەیتون دەلیلە و کوڕەکەی کە ناوی ئیکارە، هەروەها حیکایەتی (بساط الریح- فەرشە با) خەویان بەوەوە دیوە کە خێرایی. ڕەوتیـان لە سـەر زەوی زیاتر بێ هەوەک لە حیکایەتی کـەوشـە تیـژڕەوەکـان"[١٩]. حیکایەتی منداڵان ژانرێکی بە تایبەت خۆشەویست و سەرنجڕاکێش و گێڕدراوەی داهێنانی میللییە.





بە بڕوای سۆخەملێنیسکی "حیکایەت یاری خەیاڵە-کانگایەکی ژیان بەخشە بۆ بیرکردنەوەی منداڵان و جۆشدانی هەست و هەوڵ و کۆشش دان. لە ڕێگای کەسانی ناو حیکایەتەکەوە دەگەنە هۆش و مێشکی منداڵ. بەم جۆرەش وشە دەبێتە مەودای ژیانی ڕۆحیانەی منداڵ و ئامرازێک بۆ دەربڕینی بیرو هەست و نەستی...دەبێتە واقیعی پڕژیانی بیرکردنەوەی. هەر لە ژێر کار تێکردنی ئەو هەستانەی کە کەسانی حیکایەتەکە لە مێشکی منداڵدا دەیبزوێنن، منداڵ فێری ئەوە دەبێت کـە لە ڕێگای وشـەوە بـیر بکاتەوە. بە بێ بوونی حـیکایەتێکی پڕ ژیان و ڕووناک و پڕتوانای ئەوتۆ کە هۆش و هەستی منداڵ بخاتە ژێر کارتێکردنی خۆیەوە، مەحاڵە باس لە بیر کردنەوە و قسە فێر بوونی منداڵان بکرێت."[٢٠]

منداڵان لەوەدا کە بە بیرو هەست و نەستیان لە جیهانی کەسایەتی ڕووداوەکانی حیکایەت دا دەژین هەست بە خۆشییەکی قـووڵ دەکەن تەنانەت منداڵ دەتوانێت پێنج جار یان دە جار هەمان حیکایەت دووپات بکاتەوە و هەر جارەش شتێکی نوێی تێدا بدۆزێتەوە، حیکایەتی گیانداران شێوەیەکی تایبەتی ژانری حیکایەتە. بەو پێیەی لە دێر زەمانەوە دروست بووە، ئەو حیکایەتانە وێنەی سەرنجی مرۆڤەکانی زەمـانە دێرینەکـان ئاوێنە دەکەنەوە سـەبارەت بەو گـیـاندارانە، واتە سەرنج و تاقیکردنەوەکانی یەکەمین ڕاوکەر و یەکەمین نێچیر و دواتر یەکەمین شوان و خاوەنی مەڕوماڵات بەرجەستە دەکەن.

لەو کـاتانـەدا مـەبەست و مـانای سـەرەکی ئەو حـیکایەتانە لەوەدا بووە کـە تاقـیکردنەوە و ئەزموونـــی کـەسانی گەورەتر سەبارەت بە جیهانی گیانداران بگەیەنێت بە نەوەی لاوان. لە سەرەتادا چیرۆکی ساکارو ئاسان ڕێکدەخران دەربارەی گیانەوەر و باڵندە و ماسی. پاشان لەگەڵ پەرەسەندنی بیر کردنەوەی هونەریانەدا ئەو ڕووداوانە شێوەی حیکایەتیان گرتە خۆ، ئەم ژانرە لە ماوەیەکی زۆردا دروست بوو، تا دەهات بە سوژێت و کەسانی جۆر بە جۆر دەوڵەمەند دەکرا. وردە وردە شێوەکارییە پێکهاتوە دیاریکراوەکانی شێوەیەکی هونەریی وەردەگرت. ئەم جۆرە حیکایەتە لای منداڵان خۆشەویستە، هەر هیچ نەبێ لەبەر ئەوەی کە گیانداران تیایدا بە زمانی مرۆڤ قسە دەکەن، منداڵان حەز دەکەن خەیاڵ و فەنتازیای خۆیان بە کار بهێنن و لەم خەیاڵەشیاندا خۆیان لە واقیع و شێوەی دیاری کراوی دیاردە و شتەکانی دوور دەخەنەوە.

منداڵ خاوەنی فەنتازییایەکی فراوانە، هەر بۆیە هێندەی بەسە کە کەسێکی گەورە ناوی شتێک بەرێت ئیتر ئەو شتە لای منداڵەکە دەبێتە گیاندار و ژیانێکی وا دەگوزەرێنێ کە نزیک بێت لە ژیانی منداڵەکە و لەوانەشە هەر لە فەنتازییایدا ببێتە هاورێییەکی نزیکی منداڵەکە، توانای یاریکردن و دڵخۆشبوون و خەمگینی هەبێت.

هەندێک خەسڵەتمەندی هاوبەش لە نێوان گیاندارانی حیکایەتدا خەسڵەتی مرۆڤ تێکەڵاودەکرێن، بە شێوەیەک کە گیانداران دەکەونە قسە و هەر وەک مرۆڤ هەڵسو کەوت دەکەن. ئەم تێکەڵاو کردنەش بووە هۆی ئەوەی کە هەندێک کاراکتەری گیانداران قاڵبی خۆیان بگرن و بە کار بهێنرێن بۆ بەرجەستە کردنی هەندێک خوو سیفاتی مرۆڤ وەک ڕێوی نموونەی فێڵبازییە، گورگ نموونەی بێ مێشکی و چاوچنۆکییە، کەروێشک وێنەی ترسنۆکییە.

ئیتر هەندێ گیاندار بوونە دەربڕی هەندێ خوو ڕەوشت و خەسڵەتی مرۆڤ، کەسایەتی گیانداران بوونە ئامرازێک بۆ ئامۆژگاری و ڕێنوێنی کردنی ئەخلاقیانە و پاشان بوونە بەشێک لە گاڵتەجاری کۆمەڵایەتی.

لە حیکایەتی گیاندارانادا نەک هەر تەنها گاڵتە بە هەندێک ڕەوشت و خوو وەک - بێ مێشکی و تەمەڵی و چەنەبازی - دەکرێت، بەڵکو چەوساندنەوەی بێ دەرەتانان و چاو چنۆکی و فێڵ و تەڵەکە بازی بە مەبەستی خۆ پەرستانە تاوان بار دەکرێن و دەدرێنە بەر تانە و تەشەر.

لە فۆلکلۆری کوردی دا ژمارەیەکی زۆر حیکایەتی گیانداران و باڵندە و مێروو هەن کە تیایاندا ئەو گیانەوەرانە هەروەک ئەو منداڵەی کە گوێیان لێ دەگرێ، ژیانێکی پڕ خۆشی و ئەندیشە و سەر کەوتن و نووچدان ئەبەنە سەر.

لە حیکایەتی (گۆزەی پڕ گۆشتی برژاو) دا گۆشتەکە دەستکەوتی ڕێوی و ورچ و گورگە کە هاوڕێی گیانی بە گیانی یەکترین. ئەوان وا بڕیار ئەدەن کە گۆشتەکە هەڵگرن بۆ زستان و لە ئەشکەوتێکدا بیشارنەوە، بەڵام ڕێوی پیلانی خۆی هەبوو، دەیویست وردە وردە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، گۆشتەکە بخوا و هیچ شوێنەوارێک بە جێ نەهێڵێ. هەموو ڕۆژێک کە هەر سێکیان پێکەوە پیاسەیان دەکرد، مام ڕێوی لە پڕ هەڵوێستەیەکی دەکرد، وەک بلێی گوێی لە بانگی کەسێک بوو بێت، هاواری لێ بەرزدەبووەوە و دەیوت (ها ها) . ورچ و گورگ لەم کارە سەرسام





دەمان و پرسیاریان لێدەکرد، دەیان وت، چی ڕوویداوە؟ ئەویش ئەیوت: ئەوە ڕێوییەکی دۆستمە منداڵی دەبێت، بانگم دەکا بچم بە هانایەوە، ئەوانیش دەیانوت: دەیسا وایە فەرموو بڕۆ بەلایەوە. ڕێوی ڕاستەوخۆ ڕووی دەکردە ئەشکەوتەکە و گۆزەکەی دەر دەهێنا و تێر سکی خۆی گۆشتی دەخوارد. ئەم کارە چەند ڕۆژێک لەسەر یەک دووبارە دەبووەوە، تا لە ئاکام دا تەقەی لە گۆشت هەڵساند.

کاتێکیش ورچ و گورگ زانییان کە گۆزەکە بۆش و بەتاڵە و هیچی تیا نەماوە. بە سەر سامییەوە سەیری یەک دەکەن، لەم کاتەدا مام ڕێوی فێڵبازی خۆی دەخاتە کارو دەڵێت : بۆ ئەوەی تاوانبار بدۆزینەوە، چاک وایە کە هەر سێکمان خۆمان لە بەر خۆر ڕاخەین هەر کەسێک زیاتر لە هەموان ڕۆنی دەردا ئەوا دیارە ئەو گۆشتەکەی خواردووە. گورگ و ورچ بەم تەگبیرە ڕازی دەبن و چاوە ڕێی ڕۆژێکی خۆش دەکەن و هەر سێکیان لە بەر خۆردا لێی پاڵ دەکەون و بەو پێیەی کە مام ورچ لە هەموان قەڵەوترە ڕۆنێکی زۆر دەردەدا و گورگ و ڕێویش بە بێ سێو دوو پەلاماری دەدەن و دەیخۆن.

لەم حیکایەتەدا باس لەوە دەکرێ کە تا چ ڕادەیەک ڕێوی فێڵبازە و گورگ و مام ورچیش ساویلکەو خۆش باوەر و بێ مێشکن.

لە زوربەی حیکایەتەکاندا فێڵبازی ڕێوی دەخرێتە ڕوو، بەڵام لە هەندێکیاندا وەک حیکایەتی (ڕێوی و لەقلەق) کە بەسەرهاتەکانی ڕەوتێکی تر دەگرنە بەر و لەم حیکایەتەدا ڕێوی لەقلەق بانگ ئەکا بۆ نان خواردن لە قاپێکی دەم پەلدا خواردنەکەی بۆ دادەنێ. لەقلەق زوو لە مەبەستی ڕێوی تێدەگات و دەزانێ کە دەیەوێت گاڵتەی پێ بکات، بەڵام هیچ خۆی لێڵ ناکات و بانگی دەکات بو قاوەڵتی، کاتێک ڕێوی دێت دەبینێ کە لەقلەق گۆشتەکەی کردوەتە ناو گۆزەیەکی مل باریکەوە، ڕێوی تێ دەگات کە لەقلەق هەقی خۆی لێ کردوەتەوە و لەو فێڵبازتر دەرچوو.

منداڵان بەو پەڕی خۆشییەوە گوێ لەم حیکایەتە دەگرن و پڕ بە دڵ بە مام ڕێوی پێدەکەنن، پێیان خۆشە کە فێڵبازییەکەی ئەم جارەی سەری نەگرت.

هەروەها بە سۆزو بەزەییەوە گوێ لە حیکایەتی بەرخ و کارژۆڵەی ون بوو دەگرن، بە تایبەتی

کە ئەو گیاندارانە لە ناوچە کشتوکاڵییەکاندا دۆست و هاوڕێی ڕۆژانەی منداڵانن. خەیاڵ و فەنتازیایان بە هەڵەدا ناچێت و هەردەم دەزانن کە قسە بۆ کێ دەکەن و چۆن ئەم حیکایەتانە هاو جووتن لەگەڵ خواست و زەوقی منداڵانی گوێگردا.

یان چ خۆشی و پێکەنینێک لە ناو دڵ و چاوانی منداڵاندا دەکرێتەوە کاتێک باسی ئەو بەرخەیان بۆ دەکەن کە لەسەر دارێکەوە دەکەوێتە خوارەوە و چەندین گیانداری زل و زەبەلاح دەترسێنێ و وا لە ورچ و گورگ و ڕێوی دەکا، کە خۆیشیان نەزانن، بۆ کوێ ڕاکەن. منداڵان بەزەییان بە گیانداری لاوازو بێ دەرەتان دا دێتەوە، نەک هەر لەبەر ئەوەی کە بەراووردی دەکەن لە گەڵ خۆیاندا و خۆیان دەخەنە ئاستی ئەوان و بەس، بەڵکو لەبەر هەستی دادپەروەریش چونکە ئەوان باوەڕیان وایە کە چاکە هەردەم دەبێ بە سەر خراپە دا سەرکەوێ، هەروەها حیکایەتی گیانداران، هەستی منداڵان بەلای خۆیدا رادەکێشێ و هەردەم تینویەتی زانین و شت فێر بوونیان دەشکێنێ و سنووری جیهانیان بۆ فراوانتر دەکەن.

ئەم جۆرە حیکایەتانە لە هەر شتێکی تر زیاتر هەستی ڕێز گرتنی منداڵان بەهێزدەکەن، ڕێنماییان دەکەن کە داب و نەریتی باوو باپیریان بپارێزن.

بەم جۆرەش ئەم حیکایەتانە نەک هەر کات بردنە سەرێکی خۆش بۆ منداڵان دەڕەخسێنن، بەڵکو ئامانجی پەروەردەکردنیشیان هەیە، لە هەر یەکێکیاندا پەند و حیکمەتێکی تێدایە و منداڵ بە بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات ئەو پەندو حیکمەتە دەگرێتە خۆی و سوودیان لێ وەردەگرێت.

بەشێکی جیانەکراوەی حیکایەتی منداڵان لاسایی کردنەوەی دەنگ و دووبارە بوونەوەی ڕووداوو بەسەرهاتەکان و ناوی جوان و شیرینن.

بۆ نموونە حیکایەتی کیزا تەرەجان پڕە لە دووبارە بوونەوە و لە هەر دووبارە بوونەوەیەکیشدا بەسەر هاتی نوێیان دەچێتە سەر و بەم جۆرە تێکستەکە دەوڵەمەند تر دەبێت.

کیزا تەرە جان
کەتە دیزابان
نەمان هەستی خان



مشکێ خولی سەر
سوبیاری شاشک شین

دوای تێپەڕبوونی پاڵەوانی حیکایەت بە چەند ڕووداوێک، لە کۆتاییدا دەگاتە ئەو ڕادەیە:

کیزا تەرە جان
کەتە دێزابان
نەمان هەستی خان
مشکێ خولی سەر
سوبیاری شاشک شین
مێرکی مەرک قوین
ئاڤاشێک و بێک
کارسێ سەرنخوین
داربەلک وەرین
قەلا سەرب خوین
کچ سەر دەوین "٢١"

نموونەی ئەم حیکایەتە لە فۆلکلۆری منداڵاندا زۆرە، ئەمەش جۆرێکە لەو حیکایەتانە کە بەکرمانجی ژوورو وتراوە.

کانی بەربە، بەچرۆ وەربە
چرۆ هەر وەرێ لۆ بزن
بزن شیردا، لۆ داپیر دا
تا داپیرە کلکە قورەم وێدا

دوای چەند بڕگەیەک کە بە شێوەی پەخشان حیکایەت دەگێڕێتەوە، هەمان بڕگەی شیعری دێت کە لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کردووە، لەوانەشە هەندێ وشە و ڕستەی بۆ زیادبکرێ. بۆ نموونە:

شانی لکەن لە سەر کانی

کانی بەربێ چرۆ وەربێ
چرۆ هەروەرێ لۆ بزن...

منداڵان یەکجار حەزیان لەو حیکایەتانەیە کە لە زنجیرەیەک رووداوو و بەسەر هات پێکدێن و ئەڵقە لە دوای ئەڵقە رۆڵی پاڵەوانی سەرەکی پەرە دەسێنێ، سەرنج راکێش تر دەبێ.

پشقلم برد بۆ تەنوور
تەنوور پەپکەی دایە من
پەپکەم برد بۆ مەلا
مەلا قورئانی دا بە من
قورئانم برد بۆ خوا
خوا ئیمانی دا بە من "٢٢"

وەک دەبینین بە سەرهاتەکان لەم حیکایەتە شیعرییەدا ئەڵقە لە دوای ئەڵقە بە یەکەوە بەستراون. ئەو زنجیرەیە بەوە کۆتایی دێت کە خوا ئیمان و باوەڕ بە حیکایەت خوان دەبەخشێت.

ئەم جۆرە حیکایەتانە لە فۆلکلۆری منداڵاندا زۆرن، ناوەرۆکەکانیان ئەوە دەردەخەن کە تا چ رادەیەک ئاینی ئیسلام هێزو بنجی لە دەروونی خەڵکی داکوتاوە.

حیکایەت یەکجار دەوڵەمەندە و بەمەبەستی پەروەردە و ئامۆژگاریکردنی منداڵان بە سوودە چونکە حیکایەت زیاتر لە هەر ژانرێکی تری داهێنانی گێڕدراوەی میللی پاراوو پڕن لە چێژی جوانناسی و بیری ئایدیۆلۆژیانەی میللەتەوە.

لە حیکایەتدا بەردەوام چاکە بە سەرخراپەدا زاڵ دەبێ و پاڵەوانی پۆزەتیڤانە بە سەر پاڵەوانی نێگەتیڤانەدا سەر دەکەوێت و دادپەروەری بەر قەرار دەبێت. هەر بۆیەش حیکایەت ژانرێکی سەرەکی ئەو بەرهەمانەن کە گەورەکان بۆ منداڵانیان داناوە.

**ئەو بەرهەمانەی کە منداڵان**





**لە داهێنانی گەورەکانەوە وەریانگرتووە.**

هۆنراوەی مناسباتی کوردی ( ئەو شیعرانەی کە بە بۆنەیەکەوە دانراون)

هەروەک پێشتر رووغان کردەوە بەشێکی زۆری ئەو بەرهەمانەی کە ئێستا بە فۆلکلۆری منداڵان دەناسرێن لە لایەن خودی منداڵانەوە بۆ منداڵان دانراون بەڵام بەشێکی تری لە بەرهەم و داهێنانی گەورەوە وەرگیراون.

هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە سەرهەڵدان و پەرەسەندنی ئەدەبی منداڵان پێویستە پشت بە فۆلکلۆری منداڵان ببەستێت کە تایبەتمەندییەکانی سایکۆلۆژی منداڵان ئاوێنە دەکاتەوە.

منداڵان نووسەران وەک خەڵکی گەورە سەیر ناکەن و راو بۆچونیشیان بەرامبەر جیهان هاوچەشن و هاوتەریب نین لەگەڵ راوو بۆچونی گەورەکاندا. ئەوەی روون و ئاشکرایە لە بۆنە جیاجیاکانی ژیانی میللیدا فۆرمی یارییە کە سەرنجی منداڵان رادەکێشێ، نەک جەوهەرو ناواخنە نەریت ئامێزەکانی ئەو بۆنەیە، ژمارەیەکی زۆری بۆنەی واش هەبوون کە منداڵان بەشدارییەکی چالاکانەیان لە شێوە و نەریتی بەرێوە بردنیاندا کردوە.

یەکەمین کۆمەڵە بەرهەمە دەست نیشان کراوەکان بریتین لەو گۆرانییە منداڵانانەی کە تەرخان کراون بۆ چەند رۆژ و جەژنێکی ناسراوو هەردەم هاوجووت بوون لە گەڵ جۆری شێوەی ئاهەنگێرانی ئەو بۆنانە، زیاتر ئەو گۆرانیانە باون کە لە هەندێ بۆنەدا منداڵان بە سەر ماڵاندا دەگەڕان و دەیان وتنەوە، گەلێک لەم گۆرانی و بۆنانە پێشتر خەڵکانی گەورە ئەنجامیان داون. بە ناوەرۆکی ئەو گۆرانییانەدا ئەوە دەردەکەوێ کە پەیوەندییان بە هەندێ داب و نەریتی ئایینییەوە هەبووە، بەڵام پاشان وردە وردە لە گەڵ رۆژگاردا ناوەرۆکێکی نوێیان وەرگرتووە. لەگەڵ ئەوە شدا ڕەنگە ئەو گۆرانی و داب و نەریتانە هێشتا لە ناو هەندێ گەلاندا هەر مابن و لە لایەن خەڵکانی گەورەوە بگوترێن و پەیڕەو بکرێن، ناوەرۆکی ئەو گۆرانیانە زیاتر هیوا دەربڕین و نیاز راگەیاندنە بەرامبەر بە کەسانی تر. ڤینۆگرادەڤ ئەو گۆرانیانەی پەیوەندییان بە رۆژ و مانگ و ساڵەوە هەیە، بە فۆلکلۆری رۆژژمێری ناو دەبات. ئەم گۆرانیانە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە باری ژیانی خەڵکەوە هەیە و بایەخیان بە ژیانی رۆژانەی منداڵی لادێنشین داوە و باسی کاروباری یاری و گیروگرفتی ژیانی رۆژانی منداڵان دەکەن.

لێتوژینەوەی ڕێکوپێک لە مەڕ بارو دۆخی ژیانی منداڵان گرنگیەکی زۆری هەیە بۆ ئەتنۆگرافیا و فۆلکلۆری ڕۆژمێری منداڵان.

بەشی دووەم بریتییە لەو بەرهەمانەی کە پەیوەندییان بە پەرستنی ڕۆژ و مانگ و دیاردە سروشتییەکانەوە هەیە چەشنی گۆرانی و شیعر و ئاواز و دەربڕین. کاتێک ئەم گۆرانی و بەرهەمانە بایەخی پەرسکارییان لە دەستدا و کەسانی گەورە پشت گوێیان خستن، بۆ منداڵان مانەوە و تێکەڵ بە شیعرە ئاوازدارەکان بوون. بۆ نموونە:

بووکە بە بارانێ سەعاتی جارانێ

هەیاران و مە یاران یا خوا داکاتە باران بۆ فە قیرو هەژاران .

لە ناوچەی بادینانیش ئەم گۆرانییە لە گەڵ بووکە بە بارانەکە دەڵێن و لە جیاتی ئەو ناوە پێی ئەڵێن (لوپک).

لۆپکی مە باران بارا

مە ژ خۆدێ ئیمان دڤێ

مە ئاڤییەک باران دڤێ

لۆپ لۆپ لۆپ "٢٣"

شەوی شەوی بەراتێ

لە شەوێکی تردا کە لە نیوەی مانگی شەعبانی مانگەکانی کۆچی کە شەوی بەراتی پێ ئەڵێن منداڵانی گەڕەک کۆ دەبنەوە و ماڵان ئەگەڕێن ونوقڵ و خورمایان دەدەنێ، بگەنە بەرهەرماڵێ ئەم بەستە دەڵێن:

شەوی شەوی بەراتێ

خوا دوو کورو کچێکتان باتێ... هتد

زانای ڕووسی پەتیبنیا لەم ڕووەوە نووسیویەتی کە لە شیعری سلاڤیانیدا گەلێک بابەت بەر چاو ئەکەون کە ڕەنگدەرەوەی هەندێ بۆنەو ڕووداوی ئایینین، ئەم شیعر و بەرهەمانە بە سەر





مرۆڤێکی لە مۆم دروست کراودا دەخوێنرێنەوە، پاشان ئەم مرۆڤە لە مۆم دروست کراوە لای منداڵان بوو بە بووک و ئەو دوعا پیاهەڵدانەش کەسانی گەورە بە سەر مرۆڤە لە مۆم دروست کراوەکە دەیانگوت، لای منداڵان بوو بە گۆرانی و یاری ئاسایی."٢٤"

## گۆرانی بانگەواز

منداڵان ئەم جۆرە گۆرانیانە بە مەبەستی ئەوە دەڵێن کە کار بکەنە سەر زیندەوەر و دیاردە سروشتیەکانی دەورو بەریان. بۆ نموونە لە بەهار و سەرەتای هاوین دا حەزیان لە گرتنی ئەستێرەیە کە لە تاریکیدا زۆر جوان و سەرنج ڕاکێش و بریقە دارە.

ناوەرۆکی ئەم گۆرانییانە لای گەلێک میللەتان لێک دەچن، منداڵان ئەم گۆرانیانە بە نیازی بەزەیی هاتنەوە یان تورە کردن، یا خود گاڵتەپێکردن دەڵێن، بۆ نموونە وەک گۆرانی خاڵخاڵۆکە، منداڵان خاڵخاڵۆکەکە بە پەنجە بەرزی دەکەنەوەو دەڵێن:

خاڵخاڵۆکە ماڵی خاڵم لە کوێیە ؟

واهیمە و شتی پڕوپووچ لە سەر شیعری ڕۆژمێر و شیعری داب و نەریت ئامێز شوێن پەنجەی بە جێ هێشتوە.

خەڵکی بەهۆی دوعاو نزاوە ویستویانە خواست و ئامانجیان بە جێ بهێنن. لێکۆڵەرەوەکان ئەوەیان دەست نیشان کردوە کە بەشێک لەم گۆرانیانە تایبەت بۆ هەندێ بۆنە وتراون و ناوەڕۆکەکانیان خواست و پاڕانەوە و نزا دەردەخەن و ئەمەش بۆ ئیتنۆگرافناسەکان گرنگیەکی زۆری هەیە."٢٥"

ئیتنۆگراف و زانایان ئاماژە بۆ بەشێک لەو گۆرانی و یارییانە دەکەن، کە بۆ هەندێ لە زیندەوەرەکان وتراون. لەم یارییانە هەندێ وشەو شیعری تایبەت بە کار ئەهێنن بۆ ئەوەی ئەو زیندەوەرانە بجوڵێنن یان بیانهێننە سەما. بۆ نموونە لەناو یەکێ لە تایفەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەفەریقادا کچێک مارمێلکەیەک ئەبینێ، بەرانبەری ڕادەوەستێ و چەپڵەی بۆ لێدەدا و دەڵێ:

مارمێلکە گەورەکە سەرت بادە.

خەڵکی گوندەکە دەگێڕنەوە کە گوایە تا کچەکە چەپڵەی لێداوە، مارمێلکەکە بەردەوام، سەری باداوە. ئەو بەرهەمە لیریکیانە کە دایەن و بە خێوکەرانی منداڵان دایانهێناوە، بەشێکی خۆش و سەرنج ڕاکێشی فۆلکلۆری منداڵانە.

ئەو بیرو بڕوایانەی لەم بەرهەمانەدا هاتون سروشتێکی ئەفسانەییان هەیە و بۆ چەندان سەدەی ڕابردوو دەگەڕێنەوە، لەگەڵ ڕۆژگاریشدا ئەم بەرهەمانە بایەخی ئەفسانەیی خۆیان لە دەست داو سروشتێکی نیمچە جیدی و نیمچە گاڵتە جاری لای گەلانی جیا جیا بە خۆیانەوە دەگرن.

ڤینۆگرادەف ئەم بەشەی فۆلکلۆری منداڵانی بە دوعای گاڵتە جاڕی ناو بردوەو ئەڵێ: هەر وەها ئەو نزاو دوعا گاڵتە جارییانەش بە نیازی هێور کردنەوەی منداڵان بە کار دەهێنرێن و هەر دەچنەوە سەر ئەم فۆلکلۆرە.

ئەو بەرهەم و بیرو ڕا بە سۆز و لیریکیانە نزا و دوعای فاڵی منداڵان دەگرنەوە، کە بە مەبەستی لەشساغی منداڵ و سەلامەتی بە کار دەهێنرێن و هەروا بە مەبەستی هێور کردنەوەی منداڵ، بەڵام ئەم بەرهەمانە کاتێک لە لایەن خودی منداڵانەوە ئەنجام دەدرێن، شێوە و ڕوخسارێکی تر دەگرنە خۆ. هەندێ جاریش لە شێوەی دوعا و نزا دەردەچن و مۆرکێکی قسە و گاڵتە جارییانە بە خۆوە دەگرن.

لە ناو کوردا پاڕانەوە و نزایەک، تایبەت بە ددان کەوتنی منداڵ هەیە، کاتێک کە منداڵ ددانێکی دەکەوێ، سێ جار ددانە کەوتوەکە بە دەوری سەری منداڵەکەدا دەگێڕن، پاشان فڕێی دەدەنە ناوئاگردان یان تەنوورەوە و دەڵێن:

با مشکەکە ددانە کۆنەکەی تۆ بەرێ و ددانێکی تازەی ئێسقان و پۆڵایینت بۆ بهێنێت.

ددانکەوتن و فڕێدانی بۆ ناو ئاگردان داب و نەریتێکی تایبەتە و سەرچاوە لە هەندی بیروباوەڕەوە هەڵدەگرێ. کارێک نییە لە خۆیەوە کرابێ.

بۆ نموونە لای زۆر گەلان داب و نەریتێکی هاوچەشن هەیە، کە کاتێک منداڵ ددانی شیری دەکەوێت فڕێی نادەن، بەڵام لە کوردستان لە هەندێ ناوچەدا، ددانە شیرییەکە فڕێ دەدەنە دەرەوەی حەوشە و ئەڵێن:





خوا گیان ددانێکی زێڕینت ئەدەمێ، سی ودوو ددانی ئێسقانم بدەرێ.

لە هەندێ ناوچەی تردا، ددانە کەوتووەکە لە خاکدا ئەشارنەوە، یا لە درزی پشت دەرگادا هەڵی دەگرن.

ئایا بۆچی ئەم داب و نەریتانە سەریان هەڵدا؟

بەلای زۆر زاناوە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە لە کۆندا خەڵکی لەو بڕوایەدا بوون، ددان کاتێ دەکەوێ، یان تاڵە قژێک، یان هەر بەش و ئەندامێکی مرۆڤ دەبێ بشاردرێتەوە و بە ئاسانی نەخرێتە بەر دەم دێو و درنج یان بەر دەستی ئەوانەی کە چاو پیسن، کە کەڵکی لێ وەربگرن، ئەم داب و نەریتە لە ڕووسیا و لە زۆر شوێنی تری ئەوروپا و جێگاکانی تری جیهان دا بە هەمان شێوە هەبووە.

پاش باران بارینی بەهاران، کاتێک کە پەلکە زێڕینە لە ئاسماندا دەر کەوتوە، کچان ڕوو بە ڕووی وەستاون وتوویانە:

پەلکە زێڕینە، ئەی پەلکی ئاسمان قژم، درێژ بێت .

چەندێک ئەم دوعاو پاڕانەوە لە بنچینە ئەفسانەییەکەی دوور کەوێتەوە، بە هەمان ئەندازە شێوەی گاڵتە جاڕی دەگرێتە خۆی.

بۆ نموونە، ئەم پاڕانەوانە لای گەلی ڕووس زۆر لە ئەفسانەوە دوور بوون و سروشتێکی فشقیات و گاڵتە جاڕانەیان هەبوە، هەر لە بەر ئەم هۆیانەش بوو ڤینۆگرادەڤ ناوی ( دوعای گاڵتە جاڕی )لێناوە.

سۆخەرولیدزێ ئەم نزایانە بە بەشێکی جیا نەکراوەی فۆلکلۆری منداڵان دادەنێ، بەڕای ئەو ئەم کارانە پێشتر سروشتی ئەفسانەییان هەبوە، بەڵام ئێستا ئەو خەسڵەتەیان لە دەستداوەو ئەرکی هێور کردنەوەی منداڵ دەبینن.

ئەو کەسانەی منداڵیان بەخێوکردووە دەزانن کاتێک کە منداڵێک ئازاری دەبێت، کەسو کاری ئەو منالە دەست بە شوێنی ئازارەکە دا دەهێنن و ئەیخورێنن، یان فوی لێ دەکەن، بەوە هێمن دەبێتەوە.

بۆ نموونە: لە ناوکورداندا کاتێک کە نان، یان ئاو ئەپەڕێتە قورگی منداڵەکە، ئاماژە بۆ

گوێسەبانەکە دەکەن و دەڵێن، ئەها چۆلەکەکە فڕی. منداڵەکەش کە سەر بەرز ئەکاتەوە، کۆکەی لە بیر ئەچێتەوە یان ئەو پریشکە خواردنەی کە پەڕیوەتە قورگی، ئاودیو دەبێت.

ئەگەر سەرنجی وردی ئەم جۆرە نزا و پاڕانەوە و خلافاندن و هێورکردنەوەو باقی کارەکانی تر بدەین، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، کە لە بنچینەدا هەر یەکێ لەم کارانە ئەرک و ئاکامێکی هەیە و لە رووی سایکۆلۆژییەوە، ئێش و ئازاری نەخۆشەکە، یان کەسەکە کەم دەکاتەوە.

ئەمەش ئاکامی ئەزموون و تاقی کردنەوەی چەندین نەوەی یەک لە دوای یەکە. لە وەختی ئێستادا ژمارەیەکی زۆر لە شیعری پاڕانەوە و دوعا لە فۆلکلۆری کوردیدا هەیە، بۆ نموونە وەک دوعای دژ بە نەخۆشی و بە چاوە بوون و مار پێوەدان و...هتد. هەندێ لەم دوعایانە داوو دەرمانیشی لە گەڵدا بە کار دێت دژی حاڵەتە دەستنیشان کراوەکان، لەو داوو دەرمانانەی کە لە پزیشکایەتی میللی کوردا بەکار دێن.

## بەرهەمی داهێنەرانەی خودی منداڵان

داهێنانی منداڵان بەشێکی بنچینەیی فۆلکلۆری منداڵان پێکدەهێنێ، بە داخەوە ئێستا هێندە سەرچاوەمان لە بەردەستدا نییە کە بتوانین هەڵوێستەیەکی ورد لەسەر ئەم بابەتە بکەین و جۆرەکانی فۆلکلۆری منداڵان دیاریبکەین.

ئاشکرایە منداڵان لە تەمەنی ٤-٣ ساڵیدا پێ دەنێنە قۆناغێکی تازە و جۆرە یارییەک دەکەن کە مۆرکی نمایشی پێوە دیارە، پێی دەڵێن یاری داهێنەرانە، ئەم جۆرە یارییانە زیاتر لە تەمەنی پێش چوونە قوتابخانە، لای منداڵان سەرهەڵدەدا و لەم یارییانەدا لاسایی مرۆڤی گەورە و چالاکییەکانی ئەوان دەکەنەوەو پەیوەندی نێوانیان دووپات دەکەنەوە، لەم یارییانەدا منداڵان هەندێ کەلوپەلی گەورە بۆ لاسایی کردنەوە بە کار دەهێنن. هەندێ کەلوپەلی پێویستی تریش کە بۆ ئەم یارییانە دەستیان ناکەوێ شتی تری لە شوێن بە کار ئەهێنن. ئەو پێشەکییانە کە بۆ سەرهەڵدانی ئەم یارییە نمایش ئامێزانە پێویستن ئەمانەن:

١) دەستنیشان کردنی ئەو چالاکی و کەلوپەلانەی بۆ ئەم جۆرە یارییانە پێویستن.
٢) بە کارهێنانی شتە ناتایبەتییەکان (ئەو شتانەی کە ئەرکێکی دیاری کراوی ئاشکرایان نییە)





بەو نیازەی بتوانن لە شوێن شتێک بە کاری بهێنن.
٣) جیا کردنەوەی چالاکییەکانی خۆیان لە چالاکی کەسانی گەورە. ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی بەرهەمی خودی منداڵ کە دەربڕی کەسایەتی و جیهانەکەی خۆیانە.
٤) بە بەراورد کردن لە نێوان بەرهەمی ئەوەی گەورە دایهێناوەو، ئەو بەرهەمانەی خودی منداڵ دایهێناون دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەو بەرهەمانەی خۆیان دایانهێناون جەخت لەسەر ئەو لایەنە دەکەن کە لەگەڵ جیهانی خۆیاندا دەگونجێ.
٥) منداڵان لەم چالاکییانەیاندا زنجیرەیەک لە چالاکی و کرداری کەسانی گەورە دووبارە دەکەنەوە کەهەر ئەڵقەیەکیان بەشێک لە ژیانی کەسانی گەورە پێک دێنێ. بە بەراوردکردن لە نێوان بەرهەمی منداڵان و کەسانی گەورە و هاوگونجانیان یەکێکە لە پێشەکییە پێویستەکان بۆ منداڵ. هەر بۆیە لە سەرەتادا کەسانی گەورە تەنیا نموونەیەکی بابەتی نین بەڵکو سەرچاوەی زانینن..

ن.م. ئەکسارین لە کاتی لێتوێژینەوەکەیدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئەم جۆرە یارییانە لە خۆیانەوە و بە شێوەیەکی خۆرسکانە سەرهەڵنادەن، بەڵکو سێ جۆرە هەلومەرجیان پێویستە، کە ئەمانەن:

١- سەرنجدانی دیمەنە جیا جیاکانی واقیعی دەورو بەری منداڵەکە.
٢- ڕەخساندنی یاری و سەرچاوەی جۆر بە جۆری پەروەردەیی.
٣- تێکەڵ بوونی بەردەوامی منداڵ و گەورە.

کار تێکردنی ڕاستەوخۆی کەسانی گەورە لەسەر منداڵ هۆکارێکی سەرەکییە لەم کارەدا. "٢٦"

بەڵام شیکردنەوەی بە دیقەت و ورد ئەوە دووپات دەکاتەوە کە هەل و مەرجە دەرەکییەکان گەرچی پێویستیشن، بەڵام بە تەنیا ناتوانن ببنە هۆی سەرهەڵدانی ئەم جۆرە یارییانە. بۆ ئەم مەبەستە پێویستە گۆڕانێکی قووڵ لە پەیوەندی نێوان منداڵ و کەسانی گەورەدا رووبدا، ئەم گۆڕانەش لە قۆناغی پەڕینەوەوە تا چوونە قوتابخانە روو دەدات. واتە لە (٦-٣) ساڵی.

لەم قۆناغەدا منداڵ خۆی لە گەورە جیا دەکاتەوە و لە رێگەی کەرەستەکانی یارییەوە،بە چالاکی سەربەخۆوە خەریک دەبێ، لێرەشەوە هەست بە سەربەخۆییەکی زیاتر دەکا و بۆ یەکەمین

جـــــار لە جیهـانی ژیان و چالاکی کەسانی گەورەدا چاو دەکاتەوە و لێرەدا کە چالاکییەکانی کەسانی گەورە هەم دەبنە نموونەیەکی ئۆبژێکتانە و هەم سۆبژێکتانە.

لەوەپێش کەسانی گەورە نموونەی سەرەکی بوون لە ژیانی منداڵاندا، بەڵام هونەری نواندن" تەمسیل" پێوەندییەکی تازە لە نێوان منداڵان و کەسانی گەورە دادەڕێژێ، لەم جۆرە یاری یانەدا منداڵان هەوڵ ئەدەن لاسایی ژیان و چالاکی کەسانی گەورە بکەنەوە و ئەمەش ناوەرۆکێکی کۆمەڵایەتی بەم یارییانە دەبەخشێ، لەم جۆرە یارییانەدا لە رووی فۆرمەوە منداڵ چالاکییەکی سەر بە خۆیانە ئەنجامدەدا و لە رێگای ناوەرۆکیشەوە، تێکەڵ بە ژیانی کەسانی گەورە دەبێ.

چوکۆفسکی ئاماژە بۆ چوار خاسیەتی داهێنانی منداڵان دەکات:

١- دینامیکیەتی بەرهەمی منداڵان.

٢- بە کارهێنانی هۆنراوەی کورت و ئاسان کە لە کاتی هەڵبەز و دابەزیندا دەیلێن.

٣- ئەو هۆنراوە و بەرهەمانە کە خودی منداڵ دایدەهێنێ کورت دەبن.

لەم ڕووەوە نووسەر دەڵێت دانانی شیعر لە لایەنی منداڵانەوە، نیشانەی زێدە توانای زمانە. منداڵی خەمگین و گەمژە و خەواڵوو ناتوانێ شیعر بهۆنێتەوە."٢٧"

بە زۆریش ئەم هۆنراوانە هیچ ناوەرۆک و مانایەکیان تیا نییە ئەمەش خاسیەتی چوارەمە.

ئەو قۆناغەش کە منداڵ فێری قسە دەبێ، واتە لە یەک ساڵانەوە تا پێنج ساڵان چاکترین قۆناغە لە بووژاندنەوەی هۆشمەندیدا.

مێشکی منداڵ بە جۆرێکی چالاک دەکەوێتە کار بۆ تێگەیشتن و وەرگرتنی ژمارەیەکی زۆر وشە و گوتن و ڕستە و دووبارەکردنەوە.

ل.ن. تۆڵستۆی لەم ڕووەوە نووسیویەتی" ئەوەندەی لەو قۆناغەدا شت فێر بووم و تا ئێستاش پێی دەژیم بە جۆرێکی ئەوتۆ خێرا فیری شتە بەکەڵکەکان بووم کە لە بەشی داهاتوی ژیانم دا لە سەدا یەکی ئەو قەوارەیە وەرناگرم. پێنج ساڵیش ماوەیەکی کەم نییە، لەم تەمەنەدا منداڵ بە سووربوون و دڵ گەرمییەوە خەریکی داهێنانی وشەی تازە دەبن"٢٨"

ئەو کەسانەی کە لە تەمەنی دوو ساڵی یان سێ ساڵی دا سەرنجی نەش و نمای منداڵی دابێ، شارەزای ئەم تایبەتمەندییەی منداڵانە، بەڵام بە داخەوە، نە دایک و باوک و نە خزم و کەس و





کاری منداڵ لەم قۆناغەدا،

سەرنجی ژیانی منداڵ دەدەن و نە تێبینییەکانیش لەم رووەوە تۆمار دەکەن. فێربوون و گوتنی وشەی تازە لە لایەن منداڵەوە تەنیا ئاکامی لاسایی کردنەوە نییە و بەس بەڵکو بەشێکی پەیوەندی بە هەوڵ و توانای خۆیەوە هەیە.

چوکۆفسکی لەم ڕووەوە دەڵێ :"منداڵ لە رێگەی داهێنانەوە بایەخ بە زمان دەدات. مرۆڤ بە سانایی فێری زمانی خۆی نابێ ئەگەر لە منداڵییەوە قسەی پێ نەکاو بەچاکی فێری نەبێ و نهێنیەکانی تێنەگا." هەروا سەبارەت هەمان بابەت دەڵێت: "هەر بۆیە ئەگەر منداڵێک تا پێنج ساڵان بە زمانی دایک قسە نەکا لە داهاتوودا ئەگەر بەم زمانە بشخوێنێ ناتوانێ بە شێوەیەکی تەواو شارەزایی لە وردەکاری زمانەکەیدا پەیدا بکا"٢٩" چۆکۆفسکی وای دادەنێ کە منداڵ سەروا بۆ باشـتر کردنی قسە بە کارناهێنێ، بەڵکۆ لەبەر ئاسانییەکەیەتی.

ئەو دەنووسێ و دەڵێ "دەزگای دەنگی منداڵ لە بەر ئەوەی پەرەسەندوو نییە، گوتنی دەنگە هاو چەشنەکان زۆر ئاسانترە بۆی لە وتنی دەنگە جیاوازەکان."٣٠"

کێش و سەروا لای منداڵ گرنگییەکی تایبەتی هەیە، هەر بۆیە زۆربەی هۆنراوەی منداڵان کێش و ئاوازێکی ناسک و خۆشی هەیە، هەر لە بەر ئەم هۆیەشە کە ئەو یارییانەی کێش و ئاوازیان هەیە لە ناو منداڵاندا بڵاوبوونەتەوە. بۆ نموونە لێرەدا هۆنراوەیەکی منداڵان دەهێنینەوە کە بە گۆرانی و چەپڵە ڕێزانەوە دەیلێن:

هۆ ڕێوی ڕێوی هۆو
ڕێوی بێ ئیمان هۆو
شەریکی شەیتان هۆو
ئەلەکە سمۆرە هۆو
لە دەشتی چۆڵە هۆو
کاغەز ئەنووسم هۆو
ئەیدەم بە شەماڵ هۆو ..هتد

گۆرانی و فۆلکلۆری منداڵان کە ئێستا هەندێک لەو دەقانە ناوەرۆک و مانایەکی ڕوون و

ئاشكرا نادەن، ڕەنگە لە كاتی خۆیدا پڕ ناوەڕۆک بووبن، كاتێک كە دەما و دەم گواستراونەتەوە و گەلێک ووشەیان لێ پەڕیبێ، یان شێوێندرابن، كە ئێستا مانایەكی ڕاستەو خۆ و ڕوونیان نییە، وەک ئەم دەقەی كە دەڵێت:

ئاكتی پاكتی جوكتی لنگ
ئابێڵ پابێڵ دایمی لەنگ
ئێک بێک پولا پوک نەوک "٣١"

پێشتر گوتمان شیعری دایكان زیاتر لە ڕووی مۆسیقا و كێش و سەروا وە لاسایی كردنەوەی دەنگی كارتێكەر سەرنجی منداڵی ڕادەكێشا نەک ناوەڕۆک. تەنانەت ئەو منداڵانەش كە گەورەترن، دەكەونە ژێر كارتێكردنی دەنگ و كێش و ئاواز. ئێستا زۆر جار بە ڕێكەوت منداڵان دەبینین لە پێناوی گونجاندنی كێش و قافیەدا وشەیەک دێنن و یەكێكی تر دەشێوێنن و دەستكاری دەكەن، ئەگەر بۆیان ڕاست بكەیتەوە ئەوا پێت دەڵێن ڕاستە، بەڵام وا لە ڕووی كێشەوە ڕێكترە.

چۆكۆفسكی دەنووسێ، منداڵان زیاتر سەرنجی جۆرە كێش و ئاوازێک دەدەن، چونكە بە جۆرێكی وا تێكەڵ بە گەمەو هەڵبەز و دابەز دەبن كە ئاگایان لە وشە نامێنێ و ئەو سنوور و مانایانە تێدەپەڕێنن كە كەسانی گەورە بە وشەی دەدەن. ڕەنگە ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە كە منداڵان بە ئاسانی و خێرایی نەتوانن كە حەز و ویستەكانیان بە وشە دەرببڕن.

بۆ نموونە منداڵێک چەند دێڕە شیعرێكی ماقوولی هۆنییەوە، بەڵام كاتێک كە خوێندیەوە تێكو پێكیدا. لە ژیانی ئاسایی منداڵاندا گەلێک گۆرانی هەن بە پێچەوانەی گۆرانی گرەوو پارانەوە، هیچ ئەركێكی ڕاستەوخۆیان نییە لە زۆر شوێن و ڕێشدا منداڵان دەیان ڵێنەوە.

لە كوردستان زوربەی كچان گەلێک جار لەو جۆرە گۆرانیانە دەڵێن وەک:

حل حلی و بل بلی    چاوی ڕشتوە بە كلی
كلی نەبوو توتی بوو    لە ماڵەكەی سۆفی بوو
سۆفی چووبوو ژن بێنێ
كچی شەفە گول بێنێ





شەفە گولم كوتاوە
لە موسلّم بەرداوە
موسلّی خشتاو خشتە
پیری كاكم دۆڕانووە
ملی ئەسپم پەڕانووە "٣٢"

لێرەدا ئەوەی كە گرنگە دەبێ لە كاتی خوێندنەوەی ئەو دەقانەدا جۆرە بزووتن و چالاكییەک ئەنجام بدرێت و ئەمەش پەیوەندی بە جۆرە داب و نەریتێكەوە هەیە وەک (ئاهەنگ و شایی گێڕان لە هۆشمەندی منداڵاندا)سەرەڕای ئەوانە چەندان یاری و گۆرانی تر هەن كە لەو كاتانەی منداڵ دەخوێنن دەگوترێن و ئەنجام دەدرێن، لە گەڵ هەندێ گۆڕانكاری، وەک:

مەلا مەلا نوێژ ئەكا    خەڵک فێری دەس نوێژ ئەكا
بە قران وتو وێژ ئەكا    جێ بە شەیتان لێژئەكا

بە پێی بۆچوونی پەروەردەییانە ئەم گۆرانییە بۆ دڵنیایی و هێمنی و بێدەنگ كردنی منداڵ بەكاردێت. لە یاری و گۆرانی گرەوكردن دا وشە و ئاواز دێن كە مانایەكی تایبەت ناگرنە خۆیان، ئەمەش جۆرێكی تایبەتە لە فۆلكلۆری منداڵان و ڕۆڵێكی گەورە لە ژیانی ئاسایی منداڵاندا دەگێڕێ. ئەم جۆرە گرەوكردنە لە گەلێک یاری و چالاكی منداڵاندا هەستی پێدەكرێ.

جۆرە یارییەكی تر هەیە كە منداڵان بە چەشنی بازنەیی یان بەڕیز دەوەستن، یەک كەس یان زیاتر هەڵئەبژێرن بۆ ئەوەی ڕۆڵی سەرەكی لەم یارییەدا ببینن. لای زۆربەی گەلانیش ئەم جۆرە شیعرانە بۆ ئەم گۆرانیانە دەوترێن بە قافیەو ئاواز.

"شێین" ئەم جۆرە یارییە بە گرەوكردن و زۆران بازی ناو دەبا، بەڵام زیاتر گرەوكردنی بۆ بە كار دەهێنرێ.

لەم گۆرانیانەدا لە ڕێگای گرەوكردنەوە یارییەكە بەڕێوەدەبەن، منداڵانی بەشدار بوو لە بازنەیەكدا، ریزێک دەوەستن، یەكێكیان كە لەناوەڕاستدا دەوەستێ شیعر یان گۆرانی دەڵێت و لە هەر وشەیەكی دیاری كراودا كە بە ئاوازێكی تایبەت دەوترێ ئاماژە بۆ یەكێک ئەكات، یان

دەست بەسەرشانیدا دەدات، ئەو کەسە لە ڕیزەکە دەچێتە دەرەوە، بەو جۆرە لەگەڵ خوێندنەوەی شیعرەکەدا، یەک بە یەک ئەڵقەکانی ئەم زنجیرەیە دەکرێتەوە و دوایەمین منداڵ کە دەمێنێ دەیباتەوە و ئەمجا ئەو لە ناوەراستدا دەوەستێ و کۆنترۆڵی یارییەکە دەکات و دەبێتە ڕابەر، بەم جۆرە چەند جار و تا ئەو شوێنەی بیانەوێ درێژە بە یارییەکە دەدەن.

لە فۆلکلۆری کوردی دا گەلێک گۆرانی و بابەتی گرەو کردن هەن، بۆ نموونە:

هەللور بللور

هەللور بللور تەکامە

زەردو سوور و شەمامە

مێخم کوتا مێخ هەڵبەزی

کاسەی ماستم پڕ لە پووشە

خوا داویەتی ئەمە هەڵلوشە

زۆر لە بابەتاکانی گرەوکردنیش، بە پرسیارێک کۆتایی پێدێت. ئەو منداڵەی کە لە ریز دەچێتە دەرەوە ئەبێ بە نمرەی یەکێک لە منداڵەکان، بلێت و ئەمجار ئەو بکەوێتە ڕۆڵ نواندن.

ئەو گرەو و گۆرانییانەی کە لە چەشنی دیالۆگ دا دارێژراون لە ناو منداڵاندا باوو بلاون:

دایە شەڕە تێلایە

بابە شەڕە کەبابە

پوری سەگەکە چوە ژوورێ

نەنە شەڕە لەگەنە

جۆرێکی تریش لە گرەوکردن کە مانایەکی یەکگرتوویان نییە، بەلاّم هەر کۆپلە، یان دێڕێ بە جیا دیمەنێکی تایبەتی دەردەبڕێت.

هەلەق مەلەق     دەنووکی لەقلەق

تورەکە و پشتێن     یاشێخ عومەر

لەم گورانی و یاری کردنانەدا، ڕەچاو کردنی ریتم و ئاوازی شیعرەکان لە هەموو لایەنەکانی تر زیاتر بە بایەخ و سەرنج ڕاکێشە بۆ منداڵان، هەر منداڵێ لە کاتی وتنی ئەم شیعر و گۆرانیانەدا





لەم ڕووەوە هەڵەیەک بکات، یارییەکە دەدۆڕێنێ. ئەم جۆرە گۆرانیانە تەنیا لە ڕووی پەروەردە کردنەوە گرنگ نین بەڵکۆ لە ڕووی زمانیشەوە گرنگن، زۆر وشە هەن کە لەزماندا لا دەچن و نامێنن، بەلاّم لەم گۆرانیانەدا پشتاو پشت بە درێژایی چەندان سەدە پارێزراون و ماونەتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا کارێکی گرنگە.

بەشێک لەم گۆرانیانە لە کاتی ڕاوەماسی و ڕاوی ئاژەڵە دڕندەکاندا وتراون، چەند سەدەیە لە ناو خەڵکانی گەورەدا ئەم جۆرە وشە و چالاکیانە بە کار ناهێنرێن، بەلاّم لای منداڵان کران بە یاری و گەمەی گرەوکردن و شێوەی تازەیان گرتوەتە خۆ. زوربەی ئەم یاری و گرەوانە لە یەک دەچن. بەرهەمەکانی گرەوکردن بە زۆری مانایەکی تایبەت نابەخشن. شیعری ویژدانی و گاڵتە جاڕی، یان ساتیر، لای منداڵان شوێنێکی تایبەتی هەیە لە داهێنانیاندا.

گۆرانی گاڵتەجاڕی و لاقرتی کردن، نەک تەنیا بۆ منداڵ بەڵکو بۆ کەسان وخەڵکی تر، بەشێکی گرنگی فۆلکلۆری منداڵانە، گەلێک جاریش ئەو گۆرانیانە سروشتێکی بێ مەبەستیان هەیە ئارەزووی بێنەوایانەی منداڵ و گەورەش دەر دەبڕن، لەپێکەنین و گاڵتە کردن بە کەسێک، یان بە دیاردەیەکی دیاریکراو.

ڤینۆگرادەف لە کتێبەکەیدا بە ناوونیشانی (بەرهەمی درێژدان و ساتێری منداڵان) ئەم جۆرە یارییانە بە جۆرێکی نایاب لە جۆرەکانی تەشقەڵە پێکردن دادەنێ و بە یەکێک لە داهێنانی تایبەتی منداڵان کە بۆ گاڵتەجاڕی تەرخان دەکرێ.

بۆ نموونە وەک ئەوەی منداڵێک بە نیازی گاڵتە کردن بە کەسێک، دەوروو بەر دێنێتە پێکەنین یان لاقرتێیەکی وادەکا، خەڵکەکە بەو کەسە پێبکەنن و ئەو کەسەش بە خۆی نازانێ.

زۆر لەم گێچەڵ و تەشقەڵە پێکردنەش بە نیازی گاڵتە جاری و لاقرتی پێکردن ئەنجام ئەدرێن، لە دوو دێر شیعر یان چوارینەیەک پێک دێت کە منداڵەکە بە هۆیانەوە گاڵتە بەهەندێ کەس، یا کەمئەندامێک یان کەمووکووڕی کەسانی تر دەکات.

بۆ نموونە:

مەجە گەڕە     بۆم هەڵپەڕە     لە سەر بەڕە،

لێرەدا کە دوو منداڵ پێکەوە قسەناکەن، کاتێ کە ڕووبەڕوو دەبنەوە، لە بەرامبەر یەک

دەوەستن، ئەو ڕستەیەی سەرەوە دەڵێن.

ئەم جۆرە شیعرانە مەرج نییە بە نیازی گاڵتەجاڕی و تیرو توانج وترابن، بەڵکۆ حەزو ویستی حەشار دراوی ناوەوەی منداڵێکە بەرامبەر منداڵێکی تر، ڕق و تووڕەیی یەکێکیان بەرامبەر ئەوی تریان، یاخود هەر جۆرە زویر بوونێک. گەڵێک جاریش بە هەمان مەبەست منداڵان بە پەلە گوتنی ڕستەو وشە بە کاردەهێنن، بۆ نموونە لە کاتی دووپاتکردنەوەی (حەو سەدوو حەفتاو حەوت) وەک وەڕینی سەگی لێدێت و منداڵەکەی تریش پێی پێدەکەنێ. یان وەک ئەم نموونانەی خوارەوە:

چوومە چەمی چەقان، چەقەڵ چەڵتوکی ئەتەقان

مەرە لەڕ لە لاڕێ ئەلەوەڕێ

دایکم دایکم شەکە سەر ڕەش

کەوی قەڵەوی، لاقەی کەلەوی

شیری شەکی سپیم خوارد

یاری وخۆ خلافاندنی تریش لە ناو منداڵاندا هەن وەک یەک تاقیکردنەوە و (پرسیارو وەڵام) و مەتەڵ و چەندان جۆری تری لەم چەشنە گەمە و خۆخلافاندنانە کە بە ئاکام کارێکی باشە و یارمەتی زیرەکی و دیقەتکاری و بەهرەمەندی لای منداڵ دروست دەکات.

بۆ نموونە: وەک ئەوەی منداڵان لە ناو خۆیاندا مەتەڵی لەم جۆرە دەڵێن و دەپرسن (دەزانی چی ڕوویداوە؟ باوکت حەوت کوون لە سەریدایە و ئاوی گەرم لە ژێریەوە دەڕوات.) ئەو منالەی کە لەم مەتەڵە تێ ناگات، ئەپەشۆکی، تووشی ترس و گومان دەبێت، ئەوانی تریش دەست ئەکەن بە پێکەنین، وەڵامی مەتەڵەکەش ئەوەیە کە هەموو کەسێ حەوت کوون لە سەریدایە، مەبەست لە





ئاوە گەرمەکە کە لە ژێری دەڕوات، (میزە).

یان وەک ئەوەی منداڵێک لەوی تریان دەپرسێت، کەڵەشێرێ بەسەر دیوارێکەوە هێلکەیەک دەکات داخوا هێلکەکە بە لای ڕاستدا یان چەپدا دەکەوێ؟

## حیکایەتی ترس

مەتەڵ و حیکایەتی منداڵان تەنیا پێکەنیناوی نین بەڵکو هەندێ جار ترسناکیشن. منداڵ حەز لەم جۆرە حیکایەتانە دەکات بەمەرجێک کۆتاییەکەی بە خێربرێتەوە، حەز لە جۆرە حیکایەتێک دەکەن کە پێشەکیەکەی دراماتیکی بێ و ترس و گومانی تیا بێت، کۆتاییەکەشی بەلای چاکیدا بشکێتەوە.

سەرهەڵدانی ئەم جۆرە حیکایەتانەش هەندێکیان بۆ سەدەو نیوێک لەمەوپێش دەگەڕێنەوە و هەندێکی تریشیان لە لایەن خودی منداڵانەوە دادەهێنرێن، لەوانەشە ئەم جۆرە حیکایەتانە پێداویستییەکی ڕۆحی منداڵ بێن، ئەرکی سەرەکی لەم حیکایەتانەدا ترساندنی کەسێک یان کەسانێکە، بە زۆریش لە شەوانی تاریک یان پێش نووستن دەیانگێڕنەوە، حیکایەت لە ناو منداڵاندا گەلێک باوو بلاون. "٣٣"

یەکێک لەو حیکایەتانەی کە لەناو کوردا بلاوە و بە منداڵان ئاشنایە، حیکایەتی گوڕنەتەڵەیە. کە ناوەڕۆکەکەی بەم شێوەیەی خوارەوەیە.

هەبوو نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو، ڕۆژێکی بەهار چەند منداڵێکی دێ بڕیاریان دا بۆ ڕاوە کەوبچنە کێو. گەیشتنە ناوچەیەکی چڕ، ڕێگایان هەڵە کرد، پاش گەڕانێکی زۆر لە دوورەوە تیشکێکیان بینی. بڕیاریان دا بەرەو تیشکەکە بڕۆن. کە نزیکبوونەوە چوونە ژوورەوە، زانییان ئەوە ماڵی دێوە. منداڵەکانیش هێندە ماندوو برسی بوون، بە ناچاری لە ماڵی دێوەکە مانەوە. دێو منداڵەکانی تێر کردو جێگەی بۆ ڕاخستن بەو نیازەی کە خەویان لێبکەوێ و هەموویان بخوات. گوڕنەتەڵەش کە لەهەموویان زیرەکتربوو لە مەبەستی دێوەکە گەیشت، بۆیە بڕیاری دا نەخەوێت. کە دێوەکە داوای لێکرد، بخەوێت. گوڕنەتەڵە داوای لێکرد بچێت بۆ سەر کانی و ئاوی لە (سووزگی) یەکدا بۆ بێنێ. دێو هەر خەریکی ئەمە بوو، ماوەیەکی زۆری پێچوو. لەم

کاتەدا گوڕنەتەڵە هاوڕێکانی خەبەرکردەوەو ماڵی دێوەکەیان بەجێهێشت. دێوەکەش هەرچەندی دەکرد ئاو لەناو سووزگیەکەدا نەدەمایەوە. دنیاش وردە وردە ڕووناک دەبوویەوە، بۆیە ناچاربوو بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. کە گەڕایەوە بینی منداڵەکان ڕۆیشتوون، دێوەکە زۆر تورەبوو. تا هێزی تێدابوو قیژاندی، ئەوەندە توند قیژاندی تا تەقی و پارچە پارچە بوو.

ئەم جۆرە رازە ترسناکانە تایبەت بە تەمەنێکی دیاری کراون، ئەو منداڵانەی کە حەز دەکەن گوێ لەم جۆرە حیکایەتانە بگرن، یان بیان گێڕنەوە، تەمەنیان لە شەش ساڵ کەمتر نییە، بەڵام بە زۆری لە ناو ئەو منداڵانەدا باوە کە تەمەنیان لە ١٥ – ١٣ ساڵانە و ئەم رازە ترسناکانەش زیاتر منداڵان گوێی لێدەگرن و حەزی لێ دەکەن. "٣٤"

گێڕانەوەی ئەم جۆرە حیکایەتانە بۆ منداڵ هێندە ئاسان نییە، منداڵ لە کاتی گێڕانەوەی ئەم حیکایەتە ترسناکانەدا ڕووبەڕووی هەندێ کاری قورس دەبێتەوە، وەک ئەوەی پێویستە بە دروستی تەوەری ڕووداوەکان بگێڕێتەوە و گێڕانەوەکەش بۆ برادەرە گوێگرەکان هەزم بکرێ. هەندێ تاقیکردنەوەی سایکۆلۆژی لەم ڕووەوە کراون ئەوە دەگەیەنن کە لای منداڵی تەمەنی ٧-٦ ساڵی گۆڕانێکی گرنگ لەو پرینسیپە لۆجیکیانەدا ڕوو دەدات کە لە تەمەنی پێش چوونە بەر خوێندن، منداڵان لە بیرکردنەوەدا پشتیان پێدەبەستن.

لەم تەمەنەدا منداڵ وشەکان بە ڕێکوپێکی و لە کاتی خۆیدا بەکاریان دێنێ وتوانای بە کارهێنانی زمانی پەرەدەسێنێ وەک ڤیگۆتسکی دەڵێت : ئەگەر نیگار کێشان شێوەیەکی بەرچاوی لە ڕێکخستنی چالاکی داهێنەرانەی منداڵی بچوکدا گێڕاوە، بەڵام لە تەمەنی چوونە قوتابخانەدا، داهێنانی وشە دەستپێدەکا کە یارمەتی منداڵ دەدا بە شێوەیەکی تازەو بە دیقەتتر بیروڕا و هەست و نەستی خۆی دەر ببڕێت."٣٥"

گرنگی چوونە قوتابخانە لەوەشدا دەردەکەوێت کە ژیانی منداڵەکە لەگەڵ منداڵانی تردا دەستپێدەکات و شایانی باسیشە کە بەشێک لە منداڵان باشتر حیکایەت دەگێڕنەوە و لێرەشدا ڕەگەزی منداڵ (کوڕ بێت یان کچ) ڕۆڵی خۆی دەبینێ، کچان لە گێڕانەوەی حیکایەتدا لە کوڕان چالاکترن. وەک دەرئەکەوێ کە کچان پێش کوڕ توانای پاراوی زمان و گێڕانەوەیان، نەشو نما دەکات.





بۆ ئەو منداڵەی کە حیکایەت دەگێڕێتەوە، چەند پێداویستییەک هەیە کە دەبێ تێیدا بێت وەک بە ڕوونی وتنی وشەکان، توانای گێڕانەوەی هەبێ و بیر تیژ بێت و لە هەمان کاتدا بە شێوەیەکی وا حیکایەتەکە بگێڕێتەوە کە بتوانێ سەرنجی گوێگر رابکێشێ، و کاری تێبکا.

یەکی لە سیماکانی ئەو رازە ترسناکانە ئەوەیە کە منداڵان لە کاتی گێڕانەوەیدا یاری سایکۆلۆژی خۆیان هەندێ ڕووداوی نوێ دەخەنە سەری و گەلێک جار ئەو بەرهەمانەلە فۆلکلۆری میللی یە و دەماو دەم پێیان گەیشتوە، لە لایەن منداڵەوە گۆڕانکاری تێدا کراوە. ئەو کەسانەی لە هونەری منداڵان دەکۆڵنەوە، بە ئاسانی لێیان بگەن و مەبەستەکانیان بپێکن.

گەر سەرنجی زانستی فۆلکلۆری ڕووسی بدەین بۆ نموونە: بەرهەمەکانی کاپیتسە، ئەنیکین، پۆمیرانتسیڤا، ڤاسیلنیکو، میلنیکۆڤ ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە گەلێ بەشی داهێنانی شیعری فۆلکلۆری منداڵانی کورد هاو چەشنن لە گەڵ ئەو بەشانەی کە لە فۆلکلۆری ڕووسیدا هەن.

1- بەشی زۆری فۆلکلۆری منداڵانی کورد ئەو بەرهەمانەن کە لە لایەن کەسانی گەورەوە بۆیان داهێنراون وەک :

ا- لایلایە

ب- خلاڤاندن

ج- گۆرانی پیا هەڵدان

د - حیکایەت

هـ- درۆ

و - خێرا وتن

٢- ئەو بەشانەی کە لە بەرهەم و داهێنانی کەسانی گەورەوە پەڕیونەتە ناو بەرهەم و داهێنانی منداڵانەوە وەک:

ا- شیعری بۆنە (شیعری ڕۆژمیری، شیعرو گۆرانی جەژن ...هتد)

ب- شیعری ئایینیی (دوعا، پاڕانەوە و خوا پەرستی).

ج- گۆرانی ئاگادار کردنەوە و بانگەواز.

٣- ئەو بەشانەی کە بە تەواوی بەرهەم و داهێنانی خودی منداڵانن وەک:

ا- کورته شیعر (شیعرو وتەی گاڵتەجاری )

ب- وڕێنەی بەرێتم

ج- گرەو کردن

د - شیعری ویژدانی و ساتیری منداڵان (تەشقەڵە پێکردن و گاڵتەپێکردن)

ه - دووپات کردنەوەی وشەو ڕستە

و- پرسیارو وەڵام

ز - حیکایەت و ڕازی ترسناک.

## ئەدەبی منداڵان

باس و لێتۆژینەوەی زانستیانەی ئەدەب بایەخێکی گرنگ و پێویستی لە ژیانی هاوچەرخی گەلی کوردا هەیە بە تایبەتی لەم سەدەیەدا کە ڕۆژگارێکی نوێ لە بوژاندنەوەی پەیوەندی یە رۆشنبیری و ئابووری و کومەلایەتی و سیاسییەکاندا لە کۆمەڵگای کوردەواریدا دەستی پێ کردووە.

ئەدەبی منداڵانیش کە بەشێکی ئۆرگانیکی و زیندووی ئەدەبی هاوچەرخی گەلەکەمان پێکدێنێ و نیشانەیەکی دیاری ئاستی پێشکەوتنی فەرهەنگی کوردستانە، گەرچی کۆمەڵێک بەرهەمی شیعری و چیروک ومەتەڵ و بەرهەمی جۆر بە جۆر لە فۆلکلۆرو کەلەپووری گەلەکەمان تایبەت بە منداڵ هەبووە بەڵام ئەدەبی نووسراوی منداڵانی کورد لە کوردستانی بەشی عیراق دا لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا دەستپێدەکا، هەر بۆیە وا پێویست دەکا ئەدەبی منداڵان لە مێژووی ئەدەبی کوردی دا بەشێوەیەکی دروست و لۆجیکانە بەشەکانی دیاری بکرێن و ڕیزبەندییەکی زانستیانە بکرێن کە بتوانرێ شوێنی ئەدەبی منداڵان لە پرۆسەی مێژووکردی ئەدەبی گەلەکەمان دا دیاری بکرێ و ئاماژە بەقۆناغە سەرەکییەکانی بدرێ.

ئەوەندەی بزانم و لە ڕێگەی ئەو بەرهەمە چاپکراوانەی دەستم کەوتوون، دەتوانم بڵێم ئەگەر چی ئەو زاناو نووسەرو ڕۆژ نامەنووسە کوردانەی کە بایەخ بە ئەدەبی منداڵان دەدەن خزمەتی بەرچاویان پێشکەش کردوە، بەڵام تا ئێستا ئەم بابەتە بە پێی پێویست و بەگوێرەی زانیاری





ئەدەب نەخراوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە و ئەو کارەی کە پێویستە بۆی نەکراوە، ئەمەش بە هۆی ئەو هەل و مەرجە نالەبارەی لە بواری ئابووری و سیاسی دا ڕووبەڕووی گەلی کورد بوەتەوە کە تائێستاش بەردەوامە و ڕێگا لە پەرەسەندنی فیکری جوان ناسی و زانستییانە دەگرێ.

کاتێک کە دەڵێین ئەدەبی منداڵانی کورد لە سەرەتای ئەم سەردەمەوە سەری هەڵداوە مەبەستمان ئەو ئەدەبەیە کە تایبەت بۆ منداڵ نووسراوە و ئامانجی ئاراستە کردنی منداڵ بوە.

"ئەدەبی منداڵان لەو بەرهەمە زانستی و هونەرییە نووسراوە ساکارانە پێکدێ کە تایبەت و ڕاستەوخۆ بۆ ئەوان نووسراون. هەروا بەشێک لەو نووسینانەش دەگرێتەوە کە بۆ گەورە نووسراون، بەڵام منداڵان دەیانخوێننەوە، بە تایبەتی ئەو بەرهەمانەی کە سەر بە ئەدەبی کلاسیک و بەرهەمی میللین. ئەمانەش ڕۆڵێکی مەزن لە پەروەردەکردنی جوانناسیانە و ئاکاریی منداڵاندا دەگێڕن و شارەزاییان بەرین دەکەن و تێڕوانینیان دەربارەی ژیان لا دروست دەکەن."["٣٦"]

فەرهەنگۆکی نەوبەهارە : فەرهەنگێکی ساکاری عەرەبی - کوردی یە کە بە شیعر دانراوە لە لایەن شاعیری گەورەی کورد ئەحمەدی خانی یەوە نووسراوە(١٧٠٦١٦٥٠-) بە یەکێک لەو بەرهەمە هاوچەرخانە دادەنرێ کە بۆ منداڵان نووسراوە.

هۆنراوەکەی مەولەویش (عقیدەی مولوی) بەردێکی تری بناغەی ئەم ئەدەبەیە کە تایبەت بۆ ئەو منداڵ و فەقێیانە دانراوە کە لە حوجرە و مزگەوت دا دەیانخوێند، مێژووی نووسینی ئەم هۆنراوەیە بۆ ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەیەم دەگەڕێتەوە. کتابی ئەلفو بێی کوردیش (١٩٢٠) کە لە ساڵانی سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق دا نووسراوە بە هەنگاوێکی گرنگ لە مەیدانی نووسین بۆ منداڵ دادەنرێ کەلە لایەن زانای گەورە محمد باشقە نووسراوە.

## ئەدەبی منداڵان و
## قۆناغە بنچینەییەکانی پەرەسەندنی

### بەشی یەکەم

قۆناغی یەکەمی پەرەسەندنی ئەدەبی منداڵانی کورد لە کوردستانی باشور لە بیستەکانەوە تاچلەکانی سەدەی بیستەم دەگرێتەوە.

قۆناغی پاش شێوە ئایینیەکانی ئەدەبی کلاسیکی کوردی، کاتێک کە باسی مێژووی سەرهەڵدانی ئەدەبی نووسراوی منداڵانی کورد و پەرەسەندنی دەکەین ناکرێ ئەم مێژووە بەشێوەیەکی گشتی لە مێژووی ڕۆشنبیری نەتەوەی کورد جیا بکرێتەوە، بابەتەکانی ئەم ئەدەبە زیاتر باسی سەربەخۆیی نیشتمانی و ئازادی و سەربەستی گەلی کورد کە زیاتر لە پێنج سەدەیە خۆی و نیشتمانەکەی دووچاری دابەشکردن و داگیرکردن و زەبرو زەنگێکی کەم وێنە بوونەتەوەو لە سادەترین مافە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بێبەری کراون.

ئەرکی ئەم ئەدەبە خەبات بووە لە پێناوی مانەوە و پاراستن و پەرەپێدانی مێژوو و ئەدەب و زمان و کەلەپووری گەلی کورد. بارو گوزەرانی گەلی کورد کە دووچاری دابەش کردن و لێکدابڕان و چەند زاراوەیی بووە ئەمەش ئەرکی بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری قورستر کردوە و ئەو هۆکارانە ڕێگای ئەوەیان نەداوە زاراوەکانی زمانی کوردی لە زمانێکی زانستی یەکگرتوودا یەکبگرن و بە یەک ئەلفابێت بنوسرێن، هەر بۆیە دەبینین هەر یەک لە چوار زاراوە سەرەکییەکەی زمانی کوردی هەر یەکەی لە قۆناغێک و بەشێکی کوردستان دا بۆ ماوەیەکی دیاری کراوبووبە زمانی یەکگرتووی ئەدەب.





بۆ نمونە زاراوەی لوڕی لە سەدەی یانزە و دوانزەدا زمانی نووسین و خوێندنی ئیمارەتی زاراوەی (گۆران)بووە. ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیش لەو دەمەدا بەو زاراوەیە نووسراوەو پەرەی سەندوە.

بابە تاهێری هەمەدانی (٩٣٥ـ١٠١٠)کە یەکێکە لە شاعیرە گەورەکانی نەتەوەی کورد. هەموو داهێنانە مەزنەکانی خۆی بەم زاراوەیە نووسیویە.

لە سەدەی دوانزەهەمیش دا زاراوەی بۆتانی بوو بە زاراوەی سەرەکی، چەندان شاعیری مەزن و بەرهەمەکانی خۆیان بەو زاراوەیە دەنووسی و بڵاو دەکردەوە، لەوانە فەقێ تەیران (١٣٠٢ـ١٣٧٥). مەلای جەزیری (١٦٥٠ـ١٧٠٦).

سەرهەڵدانی ئیمارەتی (ئەردەڵان) کە ناوچەیەکی فراوانی لەکوردستانی ڕۆژهەڵات و خوارووی گرتبووەوە بوو بە هۆی ئەوەی زاراوەی گۆرانی تەشەنە بکا و بەرهەم و ڕۆشنبیری ئەو سەردەمەی پێبنووسرێ. لەوانەی کە بەم زاراوەیەیان نووسیوە مەلا پەریشان لە سەدەی چواردەهەمدا.. بێسارانی (١٦٤١ـ١٧٠٢) مەولەوی (١٨٠٦ـ١٨٨٢) بەرهەم و نووسینی هەموو ئەو شاعیرانە کە بەرهەمەکانیان بە زاراوەی جیاجیا نووسراون بەشێکی پتەو لە ئەدەبی کوردستان پێک ئەهێنن .

هەروا لە ئەمارەتی بابان کە زاراوەی کرمانجی خواروو بەکارهێنراوە، دەکرێ ئاماژە بە نالی و سالم و کوردی. .. بکرێت. کە بەرهەمەکانیان بە بناخەیەکی پتەوی ئەدەبی دادەنرێن.

بەشی زۆری ئەم ئەدەبە نووسراوە بۆ بەشی دووەمی سەدەی نۆزدە دەگەڕێتەوە، لەو سەر دەمەدا کە کوردستان ڕوو بەڕووی داگیر کردنی تورکیا و ئێران بووەوە. لەم ڕووەوە مارف خەزنەدار نووسیویە "لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دا ناوچە کوردنشینەکان گەلێک لە دەوڵەتی عوسمانی و ئێران دواکەوتووتر بوو. لەم قۆناغەدا بێزاری و نارەزایی یەکی زۆر لە ناو گەلی کوردا بڵاو بووبوەوە، لە ساڵانی نەوەدی هەمان سەدەدا چەندان ڕاپەڕینی میللی بەسەر کردایەتی سەرەک خێڵەکان پەیدا بوو. ئەم ڕاپەڕینانە لە بەر گەلێک هۆی بابەتی و خۆیی وەک دڕندایەتی دوژمنانی کوردستان لەلایەک و لە بار نەبوونی ئەو کەسانەی سەرکردایەتی ڕاپەڕینەکانیان دەکردو نەبوونی دامو دەزگای لە بار نەیان توانی بەسەر کەوتن بگەن." "٣٧"

لەدەمەدەمی شەڕی یەکەمی جیهاندا بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد لە ڕووی سیاسیەوە

پێینایە قۆناغێکی تازە و بە چەشنێکی ڕوونترو گشتی تر داخوازییەکانی دەخستە ڕوو و خەبات بۆ پێکهێنانی یەکێتی نیشتمانی ڕاستەو خۆ دەستی پێکرد.

هەر لەم ساڵانەدا چەند ڕاپەڕینێکی گەورە لە کوردستانی باشوور و باکووردا ڕوویاندا و چەندان ڕێکخراوی سیاسی کورد پەیدابوون، وەک کۆمەڵەی هاریکاری و پێشکەوتنی کورد کە شێخ عەبدولقادر دایمەزراند، لە ساڵی ١٩١٢ وە چەند ڕێکخراوێکی تری ڕۆشنبیری دامەزران . هەروەها لە ساڵی ١٩١٣ ڕێکخراوێکی ڕووناکبیری بە ناوی (کێخاندێنی-خوێندن) دامەزرا.

چالاکی ڕۆشنبیری بەشێکی زۆری چالاکی سیاسی ئەم کۆمەڵەو ڕێکخراوانە بوون.

ئەو ڕووداوە تراژیدیانەی لە کۆتایی سەدەی رابووردو و سەرەتای سەدەی ئێستا بەسەر گەلی کوردا هاتن هەوڵ و کۆششی دەوڵەتە زلەکان بۆ داگیر کردنی کوردستان، هەموو ئەمانە کێشەی کوردیان ئاڵۆزتر کرد وگەلی کورد بەتایبەتی دەستە ڕووناکبیرەکانی بەو ڕاستییە گەیاند کە دەبێ خەباتێکی یەکگرتوو و توندو تیژ بەرپا بکەن بۆ بە گژا چوونەوەی ئەم بارە ناهەموارە.

لە ٢٤ ی نیسانی ١٨٩٨ یشدا یەکەمین ڕۆژ نامەی کوردی بە ناوی کوردستان لە قاهیرە لە لایەن بەدرخانیەکانەوە دەرچوو! ئەم ڕۆژ نامەیە بووبوە تریبۆنێکی بەرچاو بۆ هاندان و خڕکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵک بۆ رزگاری کوردستان و یەکێتی نەتەوەی کورد.

لە هەمان کاتدا ئەم ڕۆژنامەیە لەو (٣١) ژمارەیەیدا کە دەرچوون بایەخێکی تایبەتی بە خوێندن و ڕۆشنبیری دەدا و سەرنجی گەلی کوردی بۆ لای زانست و شارستانی رادەکێشا.

هەر لەگەڵ کردنەوەی قوتابخانەکانی ئایینیەکاندا (حوجرە) چەندان مەڵبەندی خوێندنی ئایینی لە کوردستاندا کرانەوە و ناوبانگیان دەرکرد و لە گەلێک گۆشەی کوردستانەوە منداڵان و لاوان بۆ خوێندن و پەیدا کردنی زانیاری ڕوویان تێدەکرن.

لە حوجرەو قوتابخانەدا سەرەڕای فەلسەفەی ئیسلامی زمانی عەرەبی و زمانی فارسی و تورکیشیان دەخوێند و لۆجیک و ڕەوانبێژی دەخوێنرا وهەر لەم حوجرانەوە بایەخ بە شیعرو ڕۆشنبیری دەدرا و خودی ئەو مامۆستاو فەقێیانە کە لەم حوجرانەوە دەرسیان دەگوتەوە یان دەیانخوێند شاعیرو زمانزان بوون و بایەخیان بە زمان و ئەدەب دەدا.

ئەدیب و مێژوو ناسی کورد عەلادین سەجادی دەڵێت " لە سەدەی سێهەمی کۆچی بەم لاوە





زانایانی کورد کەوتنە نووسین و دانانی هەموو جۆرە کتێبێکی فەلسەفی، پزیشکی، ئوسوڵ، کەلام، مەنتیق، فیقھ، ریازیات و ئەدەب بە زمانی عەرەبی" "٣٨"

لەم قوتابخانانەدا کە منداڵانی کورد لە گشت لایەکی کورستانەوە ڕوویان تێدەکردن. پاش تەواو کردنی خوێندن کارنامەیان وەردەگرت کەپێی دەگوترا (ئیجازە)

خوێندن لەم حوجرەو قوتابخانانەدا زیاتر مۆرکێکی کلاسیکیانەی گرتبوە خۆی و ئەرکیان گەشە پێدانی زانستی ئایینی و(عقیدە) زانی بووە . هەر لەم قوتابخانەو حوجرانەدا پێویستی ئەوە سەری هەڵدا کە منداڵانی کورد بە زمانی کوردی بخوێنن.

لە ساڵی ١٩٢٠ دا زانای بەتوانا محمد باشقە# کتێبێکی بۆ ئەم مەبەستە بەناوی یەکەمین ئەلفوبێی کوردی بە هاوکاری مامۆستا مەحەمەد زەکی کە ئەویش یەکێک بوو لە مامۆستایانی شاری سلێمانی. ئەم پەرتوکە بەو قەوارە بچووکەشیەوە یارمەتیدەربوو بۆ دەستپێکردنی خوێندن بە زمانی کوردی لە جیاتی زمانە بێگانەکانی وەک عەرەبی و تورکی. ئەم کتێبە بوو بە بەردی بناغەی کتێبی کوردی لە قوتابخانەکاندا کتێبەکە دەنگە کوردییەکانی بەوانە شیکردووەتەوەو بە فارسی و تورکی لێکی داوەتەوە"٣٩" .

کتێبی(نەو بەهار) ی ئەحمەدی خانی کە فەرهەنگێکی عەرەبی -کوردی یە بە شیعر دانراوە کە مەبەستی سەرەکی فێربوونی زمانی عەرەبییە و یەکێکە لەو بەرهەمانەی کە ڕاستەوخۆ بۆ منداڵان نوسراوە. ئەم فەرهەنگە لە شانزە بەش پێکدێ و لە هەر بەشێکدا کتێبێکی تایبەتی شیعر بەکار هێنراوە" ٤٠"بەڵام کتێبی دووەم کە ئەویش فەرهەنگێکی کوردی عەرەبی و لە لایەن زانای ئایینی شێخ مارفەوە تایبەت بۆ ئەحمەدی کوڕی- مەبەست کاک ئەحمەدی شێخە- دایناوە، ئەم کتێبە کە هەر ناوی(ئەحمەد)یشی لێنراوە، وەک سەرچاوەیەک منداڵانی کورد بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی کەڵکیان لێوەرگرتوە. ئەم فەرهەنگە لە دوو بەش پێکدێت، بەشێکیان گۆڕینی ناوە بۆ زمانی کوردی. دووەمیشیان شیکردنەوەی ڕێزمان و بەکار هێنانی فەرمان و ئەرکەکانیان. تاپەنجاکانیش ئەم بەرهەمە یەکێک بووە لە سەرچاوەکانی فێربوونی زمانی عەرەبی بۆ منداڵان"٤١" .

(عقیدەی) مەولەویش کە لە لایەن مەولەوی شاعیرەوە دانراوە بە پێچەوانەی دوو کتێبەکەی

سەرەوە ! ئەمیان شیعرێکی درێژە و بەزمانێکی ساکار و ڕەوان بنچینەکانی ئاینی ئیسلام باسدەکا.

محمد علی قەرەداغی کە پێشەکیەکی بۆ ئەم هۆنراوەیە نووسیوە دەڵێت: "تایبەتمەندیەتی ئەم هۆنراوەیە لە ساکاری و ڕەوانی زمانەکەی دەردەکەوێ". "٤٢"

پاشان مەولەوی پێنج پرینسیپی ئاینی شی دەکاتەوە (ئیمان- باوەڕ ئیمان بە فریشتەو قورئان و پێغەمبەرەکان و ڕۆژی قیامەت و شایەتمان بە زمانێکی ساکار و رەوان ئەو پرینسیپانە بۆ منداڵان باس دەکاو لە خەیاڵ کردنەوەیان نزیک دەکاتەوە.

ئیمان باوەڕە بالێت نەشێوێ
بەشەش چت ئەوێ ئیمانت ببێ
ئەوەڵ بیزانە خودا بە حەقە
بە مەودا بە شوێن فەردی میتلەقە
بە مەسیل و شەریک بێ فەرزەند
بێجێگە و حازر بێ باب و پەیوەند

شاعیر لێرەدا هەوڵی داوە بنچینە ئایینییەکانی ئیسلام بە منداڵان ئاشنا بکات. ئەم کتێبەی مەولەوی تاقە کتێب نییە بۆ منداڵان بەڵکو چەندان کتێب و سەرچاوەی تر بۆ منداڵان نووسراون و تایبەت بیروو باوەڕی ئایینی دەردەبڕن. ئەدەبی ئایینی لە هەمان سەردەمی بوژانەوەی نەتەوەی کورد و ڕۆشنکاری دا پاش شەڕی یەکەمی جیهان سەریهەڵدا.

لە کوردستانی باشووردا هەر لە سەرەتای بیستەکانەوە لە قوتانخانەکاندا چەند ڕێکخراوێکی تایبەتی منداڵان دامەزران، وەک ڕێکخراوی (کەشافە) ئەم ڕێکخراوە بە پلەی سەرەکی ئەرکی وەرزشی و گەشت و گوزاری ئەنجام دەدا و بۆ منداڵانی پۆلی پێنجەم تا پۆلی دەیەم، واتە لە تەمەنی ١٧-١١ ساڵان.

لە سەردەمی هاتنی حیزبی بەعسا بۆ حوکم لە ساڵی ١٩٦٨ڕێکخراوێکی حوکومی بۆ منداڵان دامەزرا. لە ژێر فشاردا منداڵانی پۆلی یەک تا پێنج لەم ڕێکخراوەدا ڕێکدەخران، ئەم ڕێکخراوەیە زیاتر بیری نەتەوەیی عەرەبی لە ریزی منداڵاندا بلاودەکردەوە و ڕێکخراوێکی





ئایدیولۆژی فاشیانە بوو لە چەشنی ئەو ڕێکخراوانەی سەردەمی هیتلەر کە لە ئەڵمانیادا بۆ شوشتنەوەی مێشکی منداڵان پیرۆزکردنی سەرکردە و ڕق هەڵگرتن بەرامبەر بە گەلانی تر دامەزرابوون .

لە قوتابخانەکانی کوردستان دا منداڵانی کورد و مامۆستاکانیان و باوک و کەسو کاری منداڵان و بە شێوەیەکی گشتی گەلی کورد نەفرەتیان لەم ڕێکخراوەیە دەکرد و کوردەکان هەڵوێستێکی سلبیان لەم ڕێکخراوەیە گرتە بەر، بەڵام لە ئاکامی فشاری زۆری ڕژێمی بەعسدا ئەم ڕێکخراوەیە لە ناو قوتابخانەکانی کوردوستاندا دامەزرێنرا."٤٣"

لە بیستەکانی سەدەی بیستەوە شان بە شانی کتێبەکانی خوێندنی قوتابخانە کتێب و بەرهەمی ساکار بۆ منداڵان پەیدا بوون کە ئامانجیان فراوان کردنی بیروهۆشی منداڵان بوو، ئەم کتێبانە بە پلەی سەرەکی لە شیعر پێک دەهاتن و هەندێ جاریش شیعری وەرگێڕاویان دەگرتە خۆ. هەروا چەندان حیکایەتی کوردی و فارسیش * لەبەرگی کتیب دا تایبەت بۆ منداڵان چاپ و بڵاوکرانەوە. لە ناو ئەو نووسەرو شاعیرانەدا کە لە داهێنانەکانیاندا سەرەتای ئەدەبی تازەی منداڵان دەستی پێکرد، دەکرێ ئاماژە بە ژمارەیەکیان بکەین: زێوەر و پیرەمێرد و بێکەس و گۆران .

ئەم شاعیرانە لە بەرهەمەکانیاندا کە ئاراستەی منداڵانیان کردووە بە زمانێکی ئاشنا لە دڵ و دەروونی منداڵ ئەو بابەت و باسانەیان پێکاوە کە منداڵان لە ژیانی ڕۆژانەدا ڕووبەڕوویان دەبنەوە، وەک خوێندن و قوتابخانە و بایەخ دان بە زانست و خۆشەویستی نیشتمان.

سیان لەو چوار شاعیرە خۆیان لە قوتابخانەدا وەک مامۆستا کاریان کردووە و چوارەمیشیان کە پیرەمێردە، شاعیرو ڕۆژنامە نووس و زانا بوو. بە جۆرێکی شارەزایای ئەزمونی پەروەردەی خۆیان لە بەرهەمەکانیاندا ڕەنگ پێ دابووە وە

## زێوەر ١٨٧٥ ـ ١٩٤٨

پیشەی مامۆستایەتی کارێکی تەواوی لە سەر بیروهۆش و بەرهەمەکانی زێوەری شاعیر دانابوو. لە شیعرەکانی دا منداڵانی بۆ خۆشویستنی قوتابخانە و خوێندن هاندەدا و خوێندنی بۆ

وەدەست هێنانی دوا رۆژێکی بەختیارو ڕووناک بە هەڵێک دەزانێ. ئەوەتا لە شیعری بۆ منداڵانی قوتابخانەدا دەڵێ:

من منداڵی بچوکم (مەکتەبە) روح سەرم
بە(سەعی)وخۆشی(دەرسم) ئەکەمە بەرم
سەعی گەر ماندوم ئەکا شادم (دەرسم) ڕەوانە
منداڵێ کەتەمەڵ بێ خوێری ناوکۆڵانانە
(دنیا ) چاوی رۆشن بووبەسایەی(عیلم وفەن) بوو
ئەی (ڕەفیقانی مەکتەب) رۆژی (عیلم و عیرفانە)"٤٣"

زێوەری شاعیر بە قووڵی تێکەڵی جیهانی ناوەوەی منداڵان دەبێت و وەک ڕێپیشاندەر و مامۆستاو باوک بەزمانێکی ساکار و ڕەوان سەرنجی منداڵ ڕادەکێشێ بۆ ئەنجامدانی ئەرکی ڕۆژانە و خوێندن و قوتابخانە و فێری خۆڕاگری و دڵفراوانیان دەکات.

**قسەی شاگردێک:**

هەموو بەیانی کە لە خەو هە ستم     پاک ئەیشۆم چاوو (ڕوومەت)و دەستم
بەفرو با نەبێ سەریشم ئەشۆم   یەک دوو پارچە نان بە چاوە ئەخۆم
جلی شەو نوستن لە خۆم لا ئەبەم   بە جلی مەکتەب - بەدەن ڕێک ئەخەم
ئەمجا هەڵدەستم بۆ چوونە مەکتەب   ئەڕۆم  بەڕێوە  بە حەیا و ئەدەب

تواناو لێهاتوویی شاعیرانەی زێوەر لە هۆنراوەیەکەوە بۆ هونراوەیەکی تر بە هێز تر دەبێ، لەو بەرهەمانەی دا کە بۆ منداڵانی نووسیوە، زێوەر جەوهەری پڕ بەهاو نرخدار بە زمانێکی ڕەوان باسەدکا و منداڵ بە خۆشەویستی نیشتمان و زانست و ئاشنا بوونی بە قوتابخانە گۆش دەکات. شاعیر تەنیا بە بانگەوازو سەرزنشت باسی خۆشەویستی نیشتمان و دایک و باوک ناکا بۆ منداڵان بەڵکو بە زمانێکی گەرم و گوڕ و داهێنانەوە باسی جوانی خاک و نیشتمان دەکات:

**شاری سلێمانی**

شاری (سولەیمانی) لە لام وەک (جەننەتە) بۆ خاسو عام





نایدەم بە (مڵکی میسرو شام) ئاوابێ وەک (دارالسلام)
(سەحرای) سەفا بەخشی دڵە داوێنی شاخی پڕ گوڵە
کەبکی لە شاخان (بلبلە) شارێکە (ساحب ئیحترام)
لای (غەربی ) چەشمەی سەرچنار  لای (شەرقی ) گۆیژەی نازدار
پشتی بە ئەزمڕ  (ئیستیوار) پێشی چیای ( عالی مەقام)"٤٤"

زێوەر لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا لە هۆنراوەکانیدا داوای ئەوەی کردوە کچان بچنە بەر خوێندن و ڕوو بکەنە زانست. ئەم جارڕدانەی زێوەر بووە هۆی ئەوەی کۆنەپەرستان و تاریکپەرستانی خۆحەشاردەر  لە پەنای ئایین دا، هێرشی توندی ببەنە سەر زێوەر و داوا لە باوک و خێزانی کچان بکەن کە کچەکانیان نەنێرنە بەر خوێندن، چونکە ئەوە کارێکی دژ بە ئایینی ئیسلامە.

زێوەر کە خۆی زانستی ئایینی خوێندوە و ڕۆشنبیرییەکی فراوانی ئیسلامی هەبوە. بەردەوام ئەو بانگەوازەی ڕاگەیاندووە. دژی کەسانی بیر تەسک و بەرچاوتاریک ڕاوەستاوە و تەنانەت هەوڵیشی داوە کە خوێندنی کچان و ئایین پێکەوە بگونجێنێ.

لە پێشەکی دیوانەکەی زێوەردا نجمەدین مەلا نووسیویە:

"هەر مامۆستا زێوەر بوو بە گۆرانی نیشتمانپەروەرانەی کوردی زمانی مناڵانی پژان، ماوەیەکی زۆر کچانی بەسەزمان بە نەخوێندەواری وەک مەلی پەڕوباڵ شکاو دیلی قەفەسبوون هەر(مامۆستا زێوەر ) بوو کە بە شیعری شیرین هانی دان کە بچنە قوتابخانە بخوێنن و چاویان بکرێتەوە بۆ ئەوەی لە پاشەڕۆژدا ببن بە دایکێکی ئەوتۆ کە بتوانن ڕۆڵەیێک پێبگەیەنن کە گەل سوودی لێ وەر بگرێ" "٤٥"

زێوەر وێنەی جیهانی ناوەوەی مرۆڤ دەکێشێ، جیهانێکی جوان و دڵێکی گەورە و پڕ لە خۆشەویستی . هەروا چەندان هۆنراوەی خۆشەویستی دەربارەی خۆشویستنی دایک و باوک نوسیوە:

ئەی بابە،  ئەی نوری (نەزەر) چەند (حەقی) تۆم کەوتۆتە سەر
هەر تۆی کە داوتە (تەربیەم ) دایم بە سەد خوێنی جگەر

خۆراکی پاک و بەرگی جوان پەیدا ئەکەی بۆم ئەی  پدەر
وەختێ(ئەزێتێکم) ببێ لات تاڵ ئەبێ (شەهد) و شەکەر

**دایک**

کێ یە ناساغ بم بکاشێن و گرین
وەختی ساغیم بێتە
خەندەو پێ کەنێن
خۆشەویستی خۆمە دایکی نازەنین
کێ یە ڕەحمی هەر لەسەر من بێ تەواو ؟
هەر خەریکی خزمەتی من بێ بە چاو
خۆشەویستی خۆمە دایکی نازەنین
وەختی پیریت دایە ئەی ئارامی گیان
کێ یە قەدرو حورمەتت بگرێ بە جان
دایەڵێ خۆمم خووا- یار، بێ و موعین (ل ٩٢)

زێوەر لە شیعرەکانیدا کە بۆ منداڵی نووسیوە کێش و ئاوازێکی بە دیقەتی ئەوتۆ بە کار دێنێ کە لەبەرکردنیان  گەلێک ئاسانە.

گەلێک شیعری گاڵتە جاریشی هەیە سەبارەت بە ڕۆژانی هەفتە و ژماردن لە (١٠ - ١) کە هەندێکیان لە گۆڤاری  (سمیر الاطفال)عربییەوە گۆڕیویە بە کوردی.

## پیرەمێرد ١٩٥٠ - ١٨٦٧

پیرەمێرد لە ساڵی ( ١٨٦٧ - ١٩٥٠) ژیاوە، شاعیر و ڕۆژنامەنووس و داهێنەر و زانای کورد  دەورێکی بەرچاوی لە بوژاندنەوەی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردیدا هەبوەو شوێنی پەنجەی بە هەموو قۆناغە بنچینەییەکانی هونەری  کوردی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دیارە. خۆشویستنی گەل یەکێکە لە بیرە سەرەکیەکانی داهێنانی پیرەمێرد ."٤٦"





پیرەمێرد پێش هەموو شتێک شاعیرە و ژمارەیەکی زۆر شیعری شارستانی و سیاسی و غەزەل و ویژدانیی دەربارەی دیمەنەکانی سروشت هەیە و  کەسەرجەم  بەرهەمێکی شیعری پڕ بایەخ و مەزن پێک دێنن ."٤٧"  پیرەمێرد سەرەڕای ئەو بەرهەمە زەبەند و خزمەتە گەورەیەی لە بواری ئەدەب و ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەگەری و گۆڕین بۆ زمانی کوردی کردونی،  بەشێکی باشی پانتایی ئەو ڕۆژنامەیە بۆ هۆنراوەو چیرۆک و حیکایەت و ڕۆشنبیریی منداڵان تەرخانکراوە.

هەر کەسێ بیەوێ باسی ئەدەبی منداڵانی کورد بکا دەبێ ئاماژە بە دەوری ئەم شاعیرە مەزنەبکات.

گەرچی لە دیوانەکەیدا شیعری کەممان بەر چاو دەکەوێ تایبەت بە منداڵان بێت،  بەڵام لەو شیعرانەی دا  کە لە دوو توێی دیوانەکەیدا هەن تواناو داهێنان و بەهرەی گەورەی ئەم شاعیرەمان بۆ دەردەکەوێ، ئەمیش وەکو زێوەر سەرەڕای خۆشەویستی نیشتمان لە شیعرەکانیدا باسی گرنگی و بڵندی خوێندن و زانست دەکا. لە شیعرێکی دا بە ناوی(چەند خۆشە بەیانیان لە خەو هەڵسان ) لەم شیعرەی دا بە جۆرێکی وا پڕ تین و تاو خۆی لەم بابەتە داوە، بۆنی بەیانیانی بەهار لە شیعرەکەی دێ.

پیرەمێرد بایەخێکی ئێجگار زۆری داوە بەوەی کە منداڵان بە خۆشەویستی زمانی دایک و مێژووی نەتەوە پەروەردە بکرێن و باسی جوامێری قارەمانە نیشتمانپەروەرەکان بۆ منداڵان دەکا و ئەو تێکۆشەرانەیان پێ دەناسێنێ کە بۆ ڕزگاری نیشتمان لە داگیر کردن خەباتیان کردووە.

هەروا پیرەمێرد هانی کچان دەدا شان بە شانی کوڕان بچنە خوێندن و تێکەڵ بە جیهانی زانست بن، لەمەشدا ئاماژەی بۆ قسەیەکی پێغەمبەر کردووە کە پشتیوانکاری خوێندنی کچانە. لێرەشدا لێهاتوانە پەنای بۆ پێغەمبەر بردووە چونکە دەزانی ئەوانەی دژی ئەوەن کچان بخوێنن کێن و چۆن کەڵکی خراپ لە ئایین وەردەگرن .

### تازه گوڵی چیمەنین

تازه گوڵی چیمەنین — بەرخە کۆرپەی وەتەنین
ئێمە کە دەستەی کچین — هەموو بۆ مەکتەب ئەچین
پێغەمبەر خۆی فەرموویە — بەهەشت ژێر پێ ی دایکانە
بەڵام دایک ئەوانەن — علیم و فەنیان ڕەوانە

هەتا سەویەی کچانمان — بەرز نەبێت لە ادراکا
منالی چاک پێ ناگا — وەتەن تەرەقی ناکا (دیوانی پیرەمێرد ٣٥١)

لێکۆڵەرەوانی ئەدەبی کوردی ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە پیرەمێرد شاعیرێکی ڕۆشنگەر بووە و شیعری وەک ئامرازێک بە کارهێناوە بۆ سەرنجدانی زانست و ڕۆشنبیرکردنی گەلەکەی بە فەرهەنگی نەتەوایەتی و جیهانی. ئەو بڕوای تەواوی بەوە هەبوە کە زانست و زانیاری باشترین ڕێگای ڕۆشنکەرەوەی تێکۆشانە بۆ گەلی کورد بۆ ڕزگار بوون لە ستەمی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و گەیشتن بە ڕزگاری و ئازادی.

## فایەق بێکەس: ١٩٠٥– ١٩٤٨

بێکەس سەرەڕای ئەوەی شاعیرێکی شۆڕشگێرو ڕۆژنامەنووسێکی بە توانا بووە، ڕاستگۆیانە کێشەی گەلەکەی ئاوێنە دەکردەوە، بانگی ئازادی دەدا بەرهەمێکی شیعری بەرچاویشی بۆ منداڵان بە جێهێشتوە کە لە ئەدەبی منداڵانی کورددا شوێنی دیاری هەیە، پانزە ساڵی دوایی تەمەنیشی کە بە کاری مامۆستایەتییەوە خەریک بوە هۆکارێکی یارمەتیدەر بووە بۆ ئەوەی زیاتر لە جیهان و حەزی منداڵان شارەزا بێت و لە ئارەزوو و خەونەکانیان نزیک بێتەوە.

بەرهەمەکانی بێکەس کە تایبەت بە منداڵانن پڕ لە گیانی خۆشویستنی ئازادی و ڕەوشت بەرزی و چاکە و جوانیین.





محەمدی مەلا کەریم لە پێشەکی دیوانەکەی بێکەسدا نووسیویە: "بێ کەس لە مەیدانی نووسینی ئەدەبی منداڵانیشدا ئەبێ بە پێشەنگ دابنرێ. ئەو سەرەڕای ئەو هەموو سروودە نیشتمانی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیییەی بۆی نووسیون و لە قوتابخانەکاندا پێی وتوون، کۆمەڵێ شیعری منداڵانیشی هەیە هەر بە ئامانجی پەروەردەکردن و ڕێگانیشاندان لە ژیاندا بۆی داناون. بۆیە ڕۆژێ لە ڕۆژان کە مێژووی ئەدەبی منالان لە زمانی کوردیدا ئەنووسرێ، بێ کەس لە ریزی پێشەوەی ئەوانەوە ئەبێ کە جێگای شایانی خۆیان لە مێژوودا وەرئەگرن."٤٨"

بێکەس لەگەڵ ئەو شوێنە دیارەی لە ئەدەبی منداڵاندا هەیەتی تا ئێستا تیشکی ڕەخنەو لێکۆڵینەوەیەکی جیدی نەخراوەتە سەر ئەو بەرهەمانەی کە تایبەت بە منداڵانن.

هەروا بێکەس لە شیعرەکانیدا بۆ منداڵ لایەنی پەروەردە کردن و لایەنی زمانەوانی دڵگیری پێکرا گرێداوە و بە شێوەیەکی قەشەنگ و بەتام بۆ منداڵان تێکەڵی کردوە. وەک ئەم نمونەیەی کە بۆمان دەردەکەوێ:

یاری کە ڕاکە پێکەنە
یاریکە ڕاکە پێکەنە
جلی بێکاری داکەنە
دەماری سیستی هەڵکەنە
یاریکە ڕاکە پێکەنە
داوێنی ڕاستی بەرمەدە
لە یارمەتیی خۆت لامەدە
خاووخلیچک خۆت بامەدە
یاریکە، ڕاکە، پێکەنە (ل١٨١)

کەلەپووری شیعری زێوەر و پیرەمێرد بۆ منداڵان زیاتر فۆرمێکی کلاسیکی دەگرنە خۆ بە تایبەتی شیعرەکانی زێوەر گەلێک وشەی عەرەبی تیایە کە لێتێگەیشتن و هەزم کردنی کارێکی ئاسان نییە. بەڵام بێکەس ئەم کەلەپوورە داهێنەرانەی زێوەر و پیرەمێردی بە شێوەیەکی هونەری و

فیکری لە فورمێکی تازەو رەنگاوڕەنگدا خستەڕوو، زیادە ڕۆییش نییە، ئەگەر بگوترێ بێکەس بە هەق لە بواری شیعری منداڵاندا درێژەپێدەرێکی داهێنەرانەیە، یان نوێکەرەوەیەکی داهێنەرانەی شیعری منداڵانە. بە بەراورد لەگەڵ ئەو شاعیرانەی کە بەر لە خۆی ژیاون و شیعریان بۆ منداڵ نوسیووە.

بەرهەمە شیعریەکانی بێکەس بۆ منداڵان هەمەڕەنگ و هەمەلایەنن و ئاڕاستەی زۆر بواری جیا جیای ژیانی منداڵ و جیهانی پەروەردە و خوێندن کراون.

بێکەس لە شیعرەکانیدا گرنگییەکی زۆری بە بابەتی پەروەردەیی و قوتابخانە و دەرس خوێندن داوە لە خەمی ئەوەدا بووە کە ژیان و کاتی حەسانەوە و خواردن و وەرزش و یاری منداڵان بە جۆرێکی لە بار ڕێکوپێک بکرێ.

بێکەس هەوڵی داوە لە پەیرەو کردنی خو و رەوشتی جوان و ڕێکوپێک لە قوتابخانە و لە ماڵ و لە ناو کۆمەڵدا یارمەتی منداڵان بدا و هۆنراوەکەی (لە قوتابخانەدا) بۆ ئەم مەبەستە تەرخانە. دەڵێت:

وەختی دەرس لە مەکتەب
دائەنیشم بە ئەدەب
لە دەرسا تێدەکۆشم
چاو لە یاری ئەپۆشم
گوێ لە مامۆستا ئەگرم
فائیدەی لێ وەرئەگرم
دەرسەکەم ڕەوان ئەکەم
ڕەنجێکی تەواو دەدەم ... هتد (ل ١٩٨)

بێکەس لە شیعرەکانیدا هەوڵیداوە بە زمانی رەوان و سەرنجڕاکێش و فێرکارانە منداڵان فێری چۆنیەتی مامەڵە لە گەڵ یەکتر و مامۆستاکانیان دا بکات، هەروەها بایەخێکی بەرچاوی بە





وەرزشی منداڵان داوە چونکە ئەو زانیویە کە رۆشنبیری وەزرشی وەک هەر رۆشنبیرییەکی تر بۆ مرۆڤ پێویستە و ئەمجۆرە کولتورەش دەبێ تێکەڵ بە جیهانی منداڵان بکرێ.

لە هۆنراوەی (کەشافە)دا بێکەس منداڵانی کەشافە باس دەکا و ئەرکی خۆشەویستی نیشتمان و ئامادە بوون بۆ داکۆکی لە گەل و نیشتمان دەگێڕێتەوە.

ئێمە کەشافەی کوردین
هەموو بەدەست و بردین
بۆ بەجێ هێنانی خزمەت
چوست وچالاک و گورجین

ئێمە کە نەوجوانین
هەر بۆ خزمەت خولقاوین
بۆ هەموومان لازمە
قەدری وەتەن بزانین "دیوانی بێکەس،"١٩٩"

شاعیر لە هۆنراوەی فڕۆکەدا دۆزێنەوە زانستیەکان بۆ منداڵان دەگێڕێتەوە و بایەخی زانست لە پێشکەوتنی کۆمەڵگەدا باسدەکا. بێکەس بەتەنگەوە بووە کە منداڵان سەرنجی دەستکەوتەکانی شارستانیەتی جیهان و پێشکەوتن و ڕۆشنبیری بدەن و لەم ڕووەوە شارەزایی پەیدابکەن.

هەروەها بێکەس خۆی لە گەلێک بابەتی کۆمەڵایەتی داوە کە هەندێکیان سەرچاوە لە داستان ودابو نەریتی کۆنەوە هەڵدەگرن. لە هۆنراوەی یەکێتی دا دەنووسێت:

پیاوێ کە خاوەنی حەوت
کوڕ بوو، جارێ نەخۆش کەوت
وتی: ئاخری عومرم
هاتووە ڕەنگە بمرم
واچاکە هەتاکوهەم

کوڕەکانم تەمێ کەم

ڕێ یەکیان نیشان بدەم

نەکەونە میحنەت و غەم...

لە کۆتایی ئەو شیعرەدا دەڵێت:

بەڵام ئەکەر لە سەر یەک بن

دەرەقەتیان نایە دوژمن

هەمیشە بەرز و ڕوو سوورن

سەربەست و شاد و مەسروورن. "دیوانی بێ کەس. ل ١٩٢"

لێرەدا باسی ئەوە دەکا کە باوکێ منداڵەکانی کۆ دەکاتەوە و چەپکە شوولێکیان دەداتە دەست و داوایان لێ دەکا بیشکێنن، دوای ئەوە کە هیچ کام لە منداڵەکان ناتوانن ئەم کارە ئەنجام بدەن، باوکەکە یەک یەک دارەکان جیا دەکاتەوە و بە سەریاندا دابەشی دەکا و بە ئاسانی یەک یەک دەیانشکێنن باوکەکە لەم حیکایەتەدا دەیەوێ منداڵەکان فێری ئەوە بکا کە بۆ بەرەنگار بوونەوە و سەرکەوتن بەسەر دوژمندا یەکێتی و هاودەنگی چەند پێویستە. بێکەس سەرەڕای ئەو شیعرانەی بۆ منداڵانی نووسیوە گەلێک بەرهەمیشی لە ئەدەبی جیهانییە وە گۆڕیوەتە سەر زمانی کوردی و ڕەنگ و بۆیەکی کوردانەی پێ بەخشیون.

**هۆنراوەی (جووتێ کۆتری نێرو مێ)**

جووتێک کۆتری نێر و مێ

ئەگەڕان لە گوێ چەمێ

بۆقێکی جوان و سەر سەوز

ئەیقیژان بە دەنگی بەرز

کۆترەکان حەزیان لێکرد

تێر و پڕ گوێ یان بۆ لەقان



بەباڵ چەپڵەیان تەقان

.... لە کۆتاییدا دەڵێت.

ئەمە حیکایەتێکە

بۆ پەند و عیبرەتێکە

یەعنی ئەبێ هەر کەسێ

لەگەڵ وەک خۆیا هەڵسێ... "دیوانی بێ کەس ل ١٩٤"

ڕووداوەکانی ئەم بابەتە لە حیکایەتی ئەندەرسۆنەوە وەرگیراون بە ناوی (بۆ قە گەرۆکەکە) کە حیکایەتێکی بە ناوبانگە. هەروا بێکەس گەلێک بابەتی لە زمانی عەرەبییەوە کردوە بە کوردی کە تایبەت بە منداڵانن وەک (شوان و مێگەل) و (شێرو مار) (جووتێک کۆتری نێرومێ)ب ێکەس لە هەوەڵێن شاعیرەکانی کوردە کە شێوەی دیالۆگی خستە ناو شیعری منداڵانەوە چونکە دیالۆگ و شێوەی گێڕانەوە خێراتر و ئاسانتر بۆ منداڵ شیدەکرێتەوە و لێی حاڵی دەبێ.

لە هۆنراوەی تۆ چیت؟ دەڵێت:

تۆ چیت؟ من کوردم      نەتەوەی گوردم

خۆ ترسنۆک نیت؟      حاشا نەبەردم

چی تۆی لەناوبرد      دوو دڵی و نیفاق

چۆن ڕزگار ئەبی؟      هەر بە ئیتیفاق ... دیوانی بێ کەس ل١٨٥

سەرەڕای ئەو شیعرو بەرهەمانەی تایبەت بۆ منداڵانی نووسیوە گەلێک سروودی نیشتمانیشی هەیە کە بوونەتە ویردی سەر زمانی منداڵ و لاوان وەک (لاوانی وەتەن) بۆ نیشتمان. لاپەرە ٢١١.

زۆر لەو سروودانەش لە هەندێ ماوەدا لە قوتابخانەکاندا خوێندراون وەک: خوایە وەتەن ئاواکەی، ئەی دلێران، شاخی ڕەنگاو ڕەنگی گوێژە.





## گۆران ١٩٠٤ – ١٩٦٢

گۆران وەک چۆن سەر قافلەی نوێکاری بوە لە شیعری کوردی دا جیهانێکی پڕ لە داهێنان و جوانیپەرستی و دید قووڵی و هەست ناسکی بووە، ئەگەرچی بەرهەمی تایبەت بە منداڵانی کەمە، ئەم نوێکارییەی لەو بەرهەمە کەمانەشیدا ڕاشکاوە کە تایبەت بۆ منداڵان نوسراوە، بابەتەکانی شیعری گۆران بۆ منداڵان بابەتی تازەن، ئاشتیخوازی و مرۆڤپەروەری و ریسوا کردنی چەوسانەوە و زەبرو زەنگ و دزیوی و چەپەڵییە، سەرنجدانێکی شیعری ساوای ئاشتیخواز دەمان باتە ئەو جیهانەی کە گۆران لەم بوارەدا نەخشی کردووە:

**ساوای ئاشتی خواز**

منالێکم کۆرپەی ناز          وەک باوکی خۆم ئاشتی خواز
کۆتری سپی تەقڵە باز          لە چەقەڵ ئەکەم دەر باز
منالێکم، منالێکم ئاشتی خواز
نامەوێ گرمەی بۆمبا          بە کوتەک لە کەللەم با
نامەوێ چەپۆکی شەڕ          ماڵی باوکم با بە با
منالێکم، منالێکم ئاشتی خواز
باوکم نابێ بێ کار بێ          ڕووت و قووت و هەژار بێ
دایکم فرمێسکی خەمی          وەک دڵۆپی بەهار بێ
منالێکم، منالێکم ئاشتی خواز
نامەوێ هەتیو کەوم          کەلاوە بێ جێ ی خەوم
لە بەر ئەوە مایەی شەڕ          کێ بێ دوشمنی ئەوم
منالێکم، منالێکم ئاشتی خواز
ئەمجا مەرجە تا ماوم بە زمانی پاراوم
گۆرانی ئاشتی بلێم          ئاشتی ڕووناکی چاوم
منالێکم، منالێکم، ئاشتی خواز دیوانی گۆران ٤٢١

گۆران لەو شیعرانەی دا کە تایبەت بە منداڵانن تەنیا ئامۆژگاری منداڵان ناکا بەڵکۆ سەرنجیان بۆ لای نهێنییەکانی ژیان و خۆشەویستی ڕادەکێشێ.

لە شیعرێکی دا منداڵان و لادێنشینەکان فێری خوشەویستی نان و خاکیان دەکا، فێری خوشەویستی کاری سەخت و بە پێزو بەرهەمی باب و باپیرانیان دەکا، هەروا لەو شیعرانەی دا کە باسی جیهانی ئاژەڵ و ڕووەک و باڵندە دەکا پڕ لە گیانی بەزەیی و نەرمی و هەست ناسکیین. شاعیر گەلێ شێوە و ڕێگای دەگمەن و نایابی دۆزیوەتەوە بۆ کار کردنە سەر هەست و نەستی منداڵ.

هەر وەک لە گۆرانی کەودا دەر دەکەوێ کە چۆن ئەم باڵندەیە باسی جوانی و دڵڕفێنی سروشتی نیشتمان دەکات کە پێویستە لە کەسانی ناحەزو بێ بەزەیی و بەدخوو بپارێزرێ.

**گۆرانی کـەو**

قەقبە، قەقبە، قەقبە، قەق          شـــــــاخی بەرزو بەردی ڕەق
جێگای چێڵەو جێگای بـــەق          قەقبەق، قەقبە، قەقبە، قەق
ڕا ئەپەڕم بەر بەیـــان          هەڵئەکشێم بۆ لوتکەی جوان
ئەخوێنم ڕوو لە ئاسمان          قەقبە، قەقبە، قەقبە، قەق.

دیوانی گۆران ل ٤٢٤

زمانی شیعری گۆران زمانێکی دڵگیرە لای منداڵ، کوردییەکی پەتی و ڕەوان و ساکار و ناسک بە ڕیتم و کێشێکی ئاسان شیعری هۆنیوەتەوە.

هەر بۆیە خەڵکانی تەمەن جیاواز شەیداو ئەوینی شیعرەکانی گۆرانن.

**بەشی دووەم**

قۆناغی دووەم لە پەرەسەندنی ئەدەبی منداڵانی کورد لە باشووری کوردستاندا، (لە چلەکانەوە بۆ شەستەکانی سەدەی بیستەم) بە سەرهەڵدانی خولیای ڕیالیستی لە چوار چێوەی هونەری ڕۆمانسی ناسراوە.

دوای شەڕی یەکەمی جیهانی لە ژێر کار تێکردنی بیروڕای ڕۆمانسیانەی ئەوروپا سەمتی





رۆمانسی لە ئەدەبی کوردی دا سەری هەڵدا، لە چلەکانەوە تا شەستەکانیش بە شێوەیەکی هەست پێکراو ئەم سەمتە جێگیر بوو.

رۆمانسیەت تێکەڵ بە داهێنانی شاعیرانی ناسراوی کوردستان بوو وەک پیرەمێرد، بێکەس، گۆران، سەلام، نوری شێخ صالح، دڵدار و ئەوانی تر. بەڵام ئەم بابەتانە جگە لە شیعر لە بەشەکانی تری هونەرو فیکردا بەرجەستە نەبوو.

بڵاوبوونەوەی دیدو بۆ چوونی مرۆڤایەتی و دیموکراتیانە لە سەرەتای سەدەی بیستەم دا زەمینەی پەرەگرتنی خولیاو مەیلی ریالیستیانەی لە ئەدەبی کوردیدا رەخساندووە، بەڵام ریالیزم تا ناوەراستی چلەکان نەبووبوە رەوتێکی کاملی ئەدەب، بۆ ئەو ساڵانە رەنگە وا راستر بێ بگوترێ: رەگەزی ریالیزم لە بەرهەمە رۆمانسییەکاندا.

ریالیزم بە شێوەیەکی تۆکمە و کامڵ لە چلەکاندا رەنگی دایەوە، کاتێک کە ئەدەب بە جۆرێکی راشکاوو پتر کێشەی رزگاریخوازی و نیشتمانی و چینایەتی و دیاردە کۆمەڵایەتیەکان رەنگ پێدایەوە.

سەرجەمی ئەم کارانە و ئەم پرۆسێسە کاریکردە سەر پەرەسەندنی ئەدەبی منداڵانی کورد. پرنسیپە راستەقینەکانی هونەری و جوانناسی و رەوشتی و فیکری لەو قۆناغەدا رۆشنتر دەرکەوت، کە زێوەر و پیرە مێرد و بێکەس و گۆرانی تیدا ژیاون، کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کردوە. ئەم پرینسیپانە بە پلەیەکی سەرەکی لە لایەن ئەو شاعیرانەوە دانران کە شیعریان بۆ منداڵان نووسیوە، رەنگە دانانی سنووری جیاکەرەوە بە ساڵ و رۆژ بۆ دەست پێکردن، یان کۆتایی هێنان بە قۆناغێک لە ئەدەبی منداڵانی کورد کارێکی ئاسان نەبێ.

بۆ نمونە گۆران ئەو بەرهەمانەی کە بۆ منداڵان نووسیوە لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا بوو، لە کۆتایی پەنجاکان، سەرەتای شەستەکان، بەڵام عومەر عبدولرەحیم لە چلەکاندا شیعری بۆ منداڵان نووسیوە. ئاشکرایە لە ساڵانی چلدا قۆناغی گەشەسەندنی هۆشمەندی نەتەوایەتی کورد روونتر دەرکەوت. لە ساڵی ١٩٤٦ دا گەلی کورد لە کوردستانی بندەستی ئێران توانی کۆماری "مەهاباد" دامەزرێنێ، ئەگەرچی ئەم کۆمارە بە کورپەیی خنکێنرا، تەمەنی ساڵێکی تێنەپەڕان، بەڵام ئەو ساڵە ساڵی بووژاندنەوەی رۆشنبیری کوردی بوو. هەر لەو ساڵەدا سێ ژمارە گۆڤاری (هەڵاڵە)،





کە تایبەت بە منداڵان بوو چاپکراو، گۆڤارێکی پڕ لە بابەتی شیعرو چیرۆک و بەرهەمی هەمەجۆر بوو کە لە لایەن نووسەرانی کوردەوە نووسرابوون یان لە ئەدەبی گەلانی ترەوە کرابوونە کوردی. هەروەها گۆڤاری (گروگاڵی منداڵانی کورد ) کە من دوو ژمارەیم بەرچاوکەوتووە لە جۆزەردانی ١٣٢٥ لە شاری مەهاباد دەرچووە.

لە کوردستانی بەشی عیراقیشدا لەو ماوەیەدا چەند رۆژنامەو گۆڤارێک دەردەچوون کە سەرجەم دەوری بەرچاویان لە بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری نەتەوایەتی و داهێنانی هونەریدا هەبوە.

لەو قۆناغانەشدا کە رووداوە رۆشنبیری و سیاسییەکان گەشەیان کردوە گرنگییەکی زیاتر بە ئەدەب و رۆشنبیری منداڵان دراوە، پەروەردە کردنی مێرمنداڵ و نەوەی تازەپێگەیشتوو بووەتە یەکێک لە باسەکانی هونەر.

لەو بابەتانەیدا کە بۆ منداڵان نووسراوە یان لە بابەتە گشتیەکاندا لەگەڵ ئەم گەشەسەندنەی کۆمەڵگەی کوردا شاعیران و نووسەران ئەوانەی کە بەرهەمیان بۆ منداڵان نووسیوە زیاتر هەستیان بە لێپرسیارێتی سەبارەت بە منداڵان کردوە هەر بۆیە دەبینین مەسەلەی سەربەخۆیی و ئازادی کوردستان و نەمانی جەورو ستەم و خۆشەویستی نیشتمان بابەتی سەرەکی ئەو بەرهەمە هونەریانەن کە تایبەت بۆ منداڵان نووسراون.

عومەر عبدولرەحیم و فەرەیدون علی ئەمین و کاکەی فەلاح و ع.ع.شەونم نوێنەرانی بەرچاوی ئەو قۆناغەن.

بەرهەمی ئەو شاعیرانە لە شەستەکاندا زیاتر گەشەیسەند، بەشێکیان بەرهەمی تایبەت بە منداڵان دەنووسن. عومەر عبدولرەحیم و فەرەیدون علی ئەمین بە دوو نووسەری ناسراوی منداڵان دادەنرێن. لە ساڵی ١٩٤٩، ئەم دوو شاعیرە پێکەوە دیوانێکی هاوبەشیان بۆ منداڵان بە ناوی (پاڵەوانی پاشە رۆژ) چاپ کرد. شیعرەکانی ئەم دیوانە تەرخان بوون بۆ مەسەلەی خەبات و رزگاری و هێزی خۆراگریی گەل.

لە ناوەرۆکی ئەم شیعرانەدا نەختە نەختە وێنەی ئەم پاڵەوانە تازەیە دەر دەکەوێ، ئەم منداڵە کوردە کە دووچاری چارەنووسێکی سەخت دەبێتەوە، ئەو ئەم راستیە دەزانێ و هەر لە منداڵییەوە

شوێن پێی پاڵەوانانی نەبەردو ئازای کوردستـــان هەڵدەگرێ و دژی دوژمنان داکۆکی لە گەل و خاکەکەی دەکا.

ئەم دوو شاعیرە ئێستاش بەردەوامن لە نووسین بۆ منداڵان، فەرەیدون علی ئەمین کتێبێکی بە ناونیشانی (پاڵەوانی بچووک) لە چاپداوە و لە شیعرەکانیدا بە شێوەیەکی هونەری نوێ خۆی لە بابەتی پەروەردە کردنی سیاسی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی منداڵان دەدا. شاعیر زمانێکی ڕەوان و ریتمـێکی فـۆلکلۆری سـانا بە کاردێنێ و ئەوەتا لەم شیـعرەی دا (بەرخەکەم نەرم و نۆڵە) دەڵێت:

بەرخەکەم نەرم و نۆڵە
پەروەردی هەردو چۆڵە
لەیاری توند و تۆڵە
خوری یەکەی سپی و سۆڵە
ئێسک سووک و خنجیلە
دووگ شۆڕەو گوێ کەڕیلە
باعەباعی ناوماڵی ساز و سەنتورو زیلە.. "دیوانی شاعیر ل١٢"

## کاکەی فەلاح

کاکەی فەلاح کە ناوی خوازیاری نووسەرو شاعیری شوێندیار ( حەمە حەمە ئەمین قادر)ە، یەکێکە لەو شاعیرانەی کە بەرهەمێکی زۆری بۆ منداڵان نووسیوە و تەواوی شیعرەکانی لە دوو کتێب دا بە ناوی شەپۆلەکان و جگەر گۆشەکان لە چاپداوە. شاعیر لە پێشەکی دیوانی دووەمیدا نووسیویە: (ئەوەی ئەم خولیاو کەڵکەڵەی خستە سەرمەوە تەنها ئەوەیە کەلە قوڵترین ناخی دڵ و دەرونمەوە سەرچاوەی خۆشەویستی یەکی تەواو ڕوون و ئێجگار گەش هەیە و هەمیشە ڕوو لە پەرەسەندن و زیادییە بەرامبەر ئێوەی منداڵ و بەچکە مرۆڤ... بڕوایەکی تەواو قووڵ و بێ سنوورم بەوە هەیە کە پێویستە بایەخێکی زۆر بە شیعر و چیرۆک و هەموو لقەکانی تری ئەدەب و ڕۆشنبیری منداڵ بدرێ."





کاکەی فەلاح گەرچی زۆربەی شیعرەکانی پەیوەندییان بە ژیانی خوێندن و پەروەردەکردنی منداڵەوە هەیە، هەوڵی چاندنی گیـــانی دادپەروەرانە لای منداڵان دەدا و ڕەخنە و ڕە خنە لە خۆگرتن لای منداڵان گەشـــــەپێدەدا.

کاکەی فەلاح لێرەدا تەنیا ئافەرین لە قوتابیە چاکەکان ناکاو بەس، بەڵکو گیانی دەرچوون و سەرکەوتن و بڕوا بە خۆبوون دەخاتە دڵی منداڵە دوا کەوتووەکانیشەوە. لە جگەرگۆشەکاندا دەنووسێت:

براکانم خوشکەکانم — هاوڕێ خۆشەویستەکانم
دەرگای مەکتەب کرایەوە — پشووی هاوین برایەوە
جانۆڕەی قوتابخانەیە — کە بۆ زانین هێلانەیە
دەرنەچووی لە کاروان جێماو — دڵی پڕ خەمە تەوز و خاو
سەد بەڵێنی بە خۆی داوە — ئیتر نەکەوێتە دواوە..

" جگەرگۆشەکان ل٩"

بەشی زۆری ئەو شیعرانەی کاکەی فەلاح کە تایبەت بە منداڵن وەک کۆمەڵە تابلۆیەک وان کە شاعیر بابەتەکانی بە نەخش و نیگار بۆ منداڵ ڕەنگ کردبێ وێنەی ئاژەڵ و باڵندەی کێوی و ماڵیی و زیرەک و دەبەنگ و ئەمەکدارو بێ وەفا. شاعیر بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش و سانا ئەوە بۆ منداڵ ڕوون دەکاتەوە کە ئەم جیهانە چەند ئاڵۆزە و هەوڵدەدا دیدو بۆچونی جیاواز سەبارەت خێرو شەڕ لای منداڵان دروست بکا. هەروا منداڵان فێری ئەوە دەکا کە پێویستە هەڵوێستی ئەخلاقییان بەرامبەر ئەو ڕووداوانە ببێ کەلە دەورو بەریاندا ڕوودەدەن کاکەی فەلاح باسی سیماو ڕەوشتە جیاوازەکانی ئەو باڵندە و گیانلەبەرانە دەکا کە لە شیعرەکانیدا بە کاری هێناون، بۆ نموونە مێش هەنگ سیمبۆلی کاری چاک و شەرەف مەندانەیە. کۆتر سونبلی ئاشتی و چاو تیژییە، بەڵام گورگ و پشیلە و جاڵجاڵۆکە سیفاتیان دزێوی و چاوچنۆکی و چەپەڵی ودڵڕەقی و درۆزنییە، وەک سیمبۆلی کەسانی درو دوژمن ناویان دەبات.

کاکەی فەلاح توانایەکی وەستایانەی لە دیالۆگی شیعری دا هەیە لەیەکێ لەو دیالۆگانەدا

بەناوی (دەمە تەقێیەک) کەڵک لە سیمبۆلی فۆلکلۆری وەردەگرێ وەک زەوی و خۆر، یا ئاو، مرۆڤ.

**هاوین**

من هاوینم، هاوینم
تیشکی خۆری زێڕینم
خاوەن سێبەری خۆشم
هەر ئاوی سارد ئەنۆشم
میوەی زۆرم لە لایە
خەرمانم لەبەر بایە
وەرزێرێکی بێ ئازارم
جل و بەرگی هەژارم

**پایز**

پایزم، وەرزی چاکم
لەناو ئێوەدا تاکم
منم باران ئەهێنم
تۆوی زۆر دائەچێنم
باران زۆر ئەبارێنم
تا کاتی پەڵە دێنم
ئاوی کانی زۆر ئەکەم
وەک ئاڵتونە گەڵاکەم

**زستان**

نەخێر من کە زستانم





گەورەی وەرزەکانم
بەوەیشومە و بە سەرما
کێ خۆی ئەگری لەبەرما
بە دەستەڵاتی زۆرم
ئاو بە سەهۆڵ ئەگۆڕم
لە لادێ بم، یا لەشار
سڕئەکەم دوپشک و مار

**بەهار**

من بەهارم شای وەرزانم
مل شکێنی زستانم
باخچەی جوانی سروشتم
بروانە دەورووپشتم
هاژەی قەڵبەزی ئاوم
ڕووناکی سەیران و گەشتم
لە شاخ و کێوو دەشتم
هەر خۆم خاوەنی نەورۆزم
جەژنی کوردی پیرۆزم

**ع. ع. شەونم**

شاعیرێکی تر کە کۆمەڵە هۆنراوەیەکی تایبەتی بۆ منداڵان هەیە بە ناوی جریوە (عەلی عەبدوللا شەونم) ە، کە لەساڵی ١٩٧١ دا بە چاپی گەیاندوو، بەڵام شیعرەکانی ئەم کتێبە بۆ ساڵانی پێشووتری داهێنانی ع. ع. شەونم دەگەڕێتەوە. ئەم شاعیرە نەک هەر بەرهەمی بە پێزی

بۆ منداڵان پێشکەش کردووە بەڵکو مامۆستایەکی باشیش بووە و پیشەی مامۆستایەتی یارمەتیەکی زۆری داوە بۆ ئەوەی شارەزای خەون و بیرو هۆشی منداڵان بێت و بەرهەمی سەرکەوتوو لە جیهانی منداڵانەوە بۆ منداڵان هەڵبژێرێ، شاعیر لە پێشەکی کتێبەکەیدا باسی لێپرسراوێتی شاعیرو نووسەران دەکا لە پەروەردە کردنی منداڵان و خستنەڕووی ئەو باسانەی کە خزمەت بە منداڵان دەکەن. ئاماژەش بەوە دەکات کە ئەدەبی تایبەت بە منداڵان تەنیا پێویستی بە هەڵوێستی داهێنەرانە نییە بەلکو هەڵوێستێکی زانستیانەشی پێویستە.

نووسەر دەبێ شارەزایی باشی جیهانی ناوەوەی منداڵان بێت بۆ ئەوەی بتوانێ بە بەرهەمەکانی رێنوێنییان بکات. هەروا دەڵێ جوانناسی لە شیعر نووسیندا بۆ منداڵان نابێت بە هەمان ئەندازەی جوانناسی بێت لە نووسینی شیعردا بە گشتی، بەڵکو پێویستە ئەو سنوورە ببەزێنێ، هەروا پێویستە کێش و ریتم و وێنە و بابەتی فیکری ئەو شیعرانە هەم قووڵ بێت و هەم ساکار، تا بەرەوانی و بێ ماندوو بوون منداڵان لێی تێبگەن و یارمەتی ئەوەیان بدا لە دەورووبەری خۆیان بگەن.

کۆمەڵە شیعری جریوە لە ٢٤ پارچە شیعر پێکهاتووە لەم شیعرانەدا شاعیر خۆی لە بابەتی جیا جیا داوە. وەک کورتە شیعری ناسک لە بابەتی شیعری فۆلکلۆری وەک گۆرانی و لایلایە و ناوی ئەو یاری و گەمانەی کە تایبەت بە منداڵانن، شیعری زەردەواڵە، بەبە، بوکەکەم، تەختەی رەش، ژمارە، هەنگ، هەور نموونەی ئەم جۆرە شیعرانەن.

شاعیر لە شیعرەکانیدا گەلێ بابەتی پێکەنیناوی هۆنیوەتەوە کە لە کاتی یاریکردندا، شادی و خۆشی بە منداڵان دەبەخشێ.

هەندێ جار شاعیر لە بەرهەمەکانیدا خوێندن و یاری تێهەڵکێش دەکا و دەزانێ کە لە رێگای گەمە و یارییەوە منداڵ زووتر فێری خوێندن و بیر کردنەوە دەبن. ئەوەتانێ لە شیعری (ژمارە)دا منداڵە بچووکەکە فێری ژماردن دەکا و لە رێگای سەرژمێرکردنی ئەندامانی خێزانەکەی و ئەرک و ئیش و کاریان لە کۆتایی دا منداڵەکە بۆی دەردەکەوێ تا ژمارە دە فێر بووە.

شاعیر هەستی جوانناسی لای منداڵان سەبارەت بە سروشت و جیهانی گیانداران و باڵندە پەرە پێدەدا و لە هەمان کاتدا منداڵ فێری ئەوە دەکا بتوانێ جیاوازی لە نێوان باش و خراپ دا





بکا و ئەمەشی بە شێوەیەکی باو و راستەوخۆ باس نەکردووە، بەڵکو بەجۆرێکی ئەوتۆ کە منداڵ بخاتە بیر کردنەوە یان لە رێگەی بیرکردنەوەوە بتوانێ جیاوازی لە نێوان چاکەو خراپەدا ببینێ.

لە شیعری باخ دا جوانی درەخت وگوڵ دەگێرێتەوە لەم رێگایەشەوە ئەوە دەخاتەڕوو کە پێویستە هەموو شتێکی جوان و قەشەنگ لە سروشت و ژیاندا بپارێزرێت.

لە شیعری چۆلەکەدا دەڵێ:

جوک جوک چۆلەکە
چۆلەکە بچکۆلەکە
بە لەرزە لەرزی باڵا
دیارە کەوتە سکاڵا

ع .ع .شەونم لە شیعرەکانی دا هەوڵدەدا ئاکارو خوو و رەوشتی دروست پیشانی منداڵان بدات و سەربەرزی و شەرەفمەندییان لا گەشە پێبدا. لە شیعرێکیدا باسی ئەو منداڵانە دەکا کە مەیلی چاو چنۆکی و خۆپەرستییان هەیە و داوای جل و بەرگی جوان و گران لە دایک و باوکیان دەکەن و ئەم بابەتانەشی زیاتر لە شیعری خەو و داوادا خستۆتە روو.

**خوازتن**

هاورێ کەل و پەل مەخوازە
بەسە داوای بێ ئە ندازە

دەمێ ئەڵێیت پەرەم بەرێ
دەمێ ئا تو خوا دا دەرێ

دەمێ قوتابییەکەی پێشم

راستەم  بەرێ خەت ئەکێشم

لە شیعری هەنگدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە تەنیا لە ڕێگای کاری خاوێن و دروستەوە مرۆڤ دەتوانی بڕوا بە خۆ بوون و بەختیاری بە دەست بێنێ. لەم شیعرەی دا باسی مێش هەنگێکی زێڕینی بچکۆلە دەکا بە شێوەیەکی شاعیرانەی بەرز وەک ئاماژە کردن بۆ دڵنەرمی و ئاشتی و کارو بەختیاری بە کاری دێنێ، لە شیعری هەوری ڕەشیش دا وەستایانە کەڵک لە سیمبۆلی میللی وەردەگرێ و لە ڕێگای دیالۆگەوە ژیانی پاشکۆیەتی کورد باس دەکا.

دەتوانین بڵێین داهێنانی شەونم ئەو لێپرسراوێتییە ڕوون دەکاتەوە کە دەکەوێتە ئەستۆی شاعیرو نووسەران. چونکە ئەوان دەتوانن لەم ڕێگەیەوە باسی سامانی زمانی نەتەوایەتی و هێزو جوانی و دەوڵەمەندی ئەم زمانە بۆ منداڵان بگێڕنەوە. ئەمەش بە شێوەیەکی ڕەوان و ساکارو بە زمانێکی ڕەسەن هەروەکو گۆرکی دەڵێ: "ساکاری شێوە و زمانی نووسەر نیشانەی لاوازی و نزمی هونەرمەند نییە بە پێچەوانەوە و نیشانەی بەرزی و دەست ڕۆیشتوویی نووسەرەکەیەتی "٤٩"

شیعری منداڵانی کورد لە ژێرکارتێکردنی بیروڕای ڕۆشنکاری لە کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەمدا سەریهەڵدا.

ئەدەب لە سنووری بیروڕای ڕیالیزمی ڕۆشنکاریدا پەرەی سەند، هەرچەند هەندێ ڕەگەزی هونەری ڕۆمانتیکیشی پاراست. ئەو گۆرانی و شیعرو یارییە فۆلکلۆری و بەرهەمە کەلەپوورییانەی کە تایبەت بە منداڵان بوون بە یەکێک لە سەرچاوەکانی داهێنان بۆ پەروەردەکردن و فێرکردنی منداڵ دادەنران و هەروا نووسەر و شاعیران لە کاتی نووسین بۆ منداڵان کەڵکیان لێ وەردەگرت. دەتوانین بەرهەمەکانی زێوەر و پیرەمێرد و بێکەس و گۆران لە نێوان بیست و چلەکانی سەدەی بیستەمدا بە یەکەم قۆناغی پەرەسەندنی ئەدەبی تایبەت بە منداڵانی کورد دابنێین، کە کۆمەڵێ بابەتی تازەی پەروەردەیی و خۆشویستنی خاک ونیشتمان و ئازادی و



بەختیاریان خستە سەر بابەتەکەنی تری ئەو ئەدەبەی کە پێشتر بۆ منداڵان نووسرابوو. زیاتر مورکێکی ئایینی و ئامۆژگاریکردنی هەبوو.

**بەشی سێیەم**

## پەیدا بوونی هونەری پەخشان لە ئەدەبی کوردی دا

لە ساڵی ١٩١٨ تا ١٩٢٧ یانزە گۆڤارو رۆژنامە دەرچوون وەک: پێش کەوتن ١٩٢٠، بانگی حەق ١٩١٨، هەتاوی کوردستان ١٩٢٢، ژیان ١٩٢٦چەند رۆژنامەیەکی تر.

ئەم بزووتنەوە رۆشنبیرییە و ئەو گۆڕانانەی بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیدا هات وای پێویست دەکرد کە فۆرمی نوێی ئەوتۆ لە ئەدەبدا سەرهەڵبدا کە لەگەڵ گۆڕانکارییە سیاسی – کۆمەڵایەتییەکانی ئەو دەمەدا بگونجێ. لێرەدا دەبێ ئاماژەی رۆڵی گرنگی فۆلکلۆریش بکرێ وەک کارێک بۆ سەرهەڵدانی ئەدەبی تازە لە سەدەی بیستەم دا.

لێتۆژەوەکانی رووسی و سۆڤیەت، بە تایبەتی پرۆفیسۆر مینۆرسکی ئاماژەی ئەوەیان کردووە کە کورد خاوەنی ئەدەبێکی فۆلکلۆری دەوڵەمەندە، وەک گۆرانی و شیعرو داستان و چیرۆکی مێژوویی و حیکایەت، شاعیرو نووسەرانی کورد کەڵکێکی تەواویان لەو رووداوو کەسایەتی و تەوەرەکانی فۆلکلۆر وەرگرتوە."٥٠"لە سەر بنچینەیەکی نوێی ئەدەبی دایانڕشتووەتەوە یان لە نووسینی بەرهەمی نوێدا کەڵکیان لێوەرگرتووە.

ئەمەش زیاتر لە داهێنانی نووسەرانی سی و چلەکانی سەدەی بیستەمدا دەبینرێ، لەوانە پیرەمێرد، حسێن حوزنی موکریانی و علادین سەجادی. هەندێ بەرهەمی تری سەرەتای سەدەی ١٩نیمچە ئەدەبی دەبینرێن کە سەرەتای هونەری تازەیان پێوەیە لە ئەدەبی کوردی دا. "٥١"

دەکرێ سەرهەڵدانی پەخشانی هونەری کورد بۆ ناوەڕاستی بیستەکانی سەدەی بیستەم بگێڕینەوە، ئەو کاتەی کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەرەسی هێناو چەندان وڵات بەسەربەخۆیی گەیشتن و خەباتی رزگاریخوازی گەلی کوردیش پێی نایە قۆناغێکی تازەوە. کۆمەڵێک بیروڕاو ئایدیولۆژیای تازە هاتنە کوردستان و ناوچەکەوە، ئەم قۆناغە تازە و ناوەڕۆکە تازەیەش لە





فۆرمێکی نوێ دا بەرجەستە بوو.

ئاشکرایە کە هونەری پەخشان لای کورد دابڕاو نەبوو لە پرۆسەی مێژووی ئەدەبیی وڵاتانی ناوچەکە و دراوسێ. پێش هەموو شتێک لە ئەدەبی تورکی و فارسی بە تایبەتی ئەدەبی تورکی کە هەوەڵین ئەدەبێک بوو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە پەیوەندی بە رۆشنبیری ئەورووپاوە هەبوو.

نووسەرانی تورکیا بەرهەمی پەخشان و هونەری ئەورووپای رۆژئاوایان دەگۆڕیە زمانی تورکی و لە سەرەتای سەدەی بیستیشدا گۆڤارو رۆژنامەکانی عیراق بەرهەمی نووسەرانی ئینگلستان و فەرەنساو رووسیایان لە تورکییەوە وەردەگرت و لە رێگای ئەم دەقە وەرگێڕدراوانەشەوە نووسەرانی ئەم وڵاتانە جۆرە ئاگاداریەکیان لەو قوتابخانە و خولیا ئەدەبییانە لا پەیدا دەبوو کە لە ئەدەبی هاوچەرخی رۆژئاوادا پەیدا ببوون.

پەخشانی کوردیش لە کەلەپوری نەتەوایەتییەوە سەرچاوەی هەڵدەگرێ بەڵکو کەڵکی لە ئەزموونی دەوڵەمەندی وڵاتانی بێگانەش وەرگرت، بە وڵاتانی رۆژهەڵات و ئەورووپای رۆژئاواشەوە.

### مەلا محەممەدی کۆیی
### ١٨٧٦ – ١٩٤٣

پەخشانی تایبەت بە منداڵان بەشێکی ئۆرگانیکی پەخشانی کوردییەو بە شێوەیەکی گشتی هەمان ناوەڕۆک دەگرێتە خۆی و دەکرێ کتێبەکەی مەلا محەمەدی کۆیی ١٨٧٦ – ١٩٤٣ بەسەرچاوەیەکی ئامۆژگاری منداڵان دابنێین.

مارف خەزنەدار دەربارەی مەلا مەحەمەدی کۆیی نووسیویە"بۆ یەکەمین جار لە ئەدەبدا پاش شەڕی یەکەمی جیهانی بیروباوەڕی رۆشنگەری بە شێوەیەکی تایبەت لە داهێنانەکانیدا رەنگیان دایەوە، لە شیعرەکانیدا جەخت لە سەر ناردنی کچان بۆ قوتابخانە دەکات. کاتێکیش یەکەمین قوتابخانەی کچان لە کۆیە کرایەوە، کچی مەلا مەحەمەد لە هەوەڵین قوتابیەکان بوو کە چووە بەر خوێندن لەو قوتابخانەیەدا"٥٢"

مەلا مەحەمەد نامیلکەیەکی بە ناوی (فری فری قەل فری) بڵاو کردەوە، شاعیر لێرەدا

گەڕاوەتەوە سەر یارییەکی فۆلکلۆری پێکەنیناوی کە تایبەت بۆ منداڵانە. ئەم یارییە پێکدێ لە دووپاتکردنەوەی چەند وشەو پرسیارێک کە ئاڕاستەی یەکێک لە منداڵەکان دەکرێت و پاشان بە کۆرسی فڕی فڕی لەگەڵ هەندێ ئاماژە و جووڵە دەیڵێنەوە، ئەگەر منداڵەکەش هەڵە وەڵام بداتەوە ئەوا هاوەڵەکانی پێی پێدەکەنن. شاعیر لەم بەرهەمەیدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئامۆژگاری منداڵان دەکـا و هەستی ڕق بەرامـبـەر بە ساختـەچیـەتی بە ناوی ئایینەوە لای منداڵان دروست دەکات.

مەلا مەحەمەد گاڵتە بەو شێخ و مەلایانە دەکا کە دەیانەوێ بە خەڵک بسەلمێنن گوایە ئەوان بەهرەیەکی خوداییان هەیە و ئەمەش یارمەتییان دەدا بۆ چوونە ئاسمان. هەروا گاڵتە بەو شێخانە دەکا کە خۆیان بە نوێنەری خودا لە

سەر زەوی ڕادەگەیەنن. ئەوەش دەگێڕێتەوە کە لە بیـستـەکانی سەدەی بیستـەمدا کاتێک شاری کۆیە بۆردومان دەکرێ ئەو شێخانە لە ترسا لە پێش خەڵکە عەوامەکەوە هەڵدێن.
مەلا مەحەمەد گرنگی زانست دژی تاریکستانی دووپات دەکاتەوە و گاڵتە بەو شێخانە دەکا کە لافی ئەوە لێدەدەن گوایە بە یارمەتی خودا دەتوانن باڵبگرن و بفڕن . نووسەر لێرەدا هەوڵی هوشیار کردنەوەی نەوەی نوێ دەدا و بایەخ بەم لایەنە دەدا

## عەبـــــدولواحـــد نوری

عـەبدولواحد نـوری یەکێکە لەو نووسەرانەی کە بە پەخشـان و بەرهەم بەشـداری لە پەروەردە کـردنی منداڵاندا کـردووە، نووسـەرێکی دیموکـراتخـوازو پێشـکەوتنخـواز بووە. ڕۆژنامـەنووس و مامۆستایەکی بە تواناو تێکۆشەر بووەو لە پێناوی دادپەروەریدا خەباتی کردووە، هەر لە مێژەوە سەودای لەگەڵ ئەدەبی پێشکەوتنخوازی تورکیدا کردوە و یەکی بووە لەو نووسەرانەی بەرهەمی بە پێزی کردووە بە کوردی.

کتێبێکی بە ناوی (پیرۆزی منداڵ) بڵاو کردوەتەوە کە کۆمەڵێک وتارو نامەیە و ژیانی هەمە لایەنەی منداڵان دەگرێتەوە. نووسەر لە کتێبەکەیدا باسی ژیانی پڕ دەردەسەری منداڵانی لادێی کوردستان دەکا و ئاماژە بە ژمارەی ئەو منداڵانە دەکا کە بەهۆی نەخۆشییەوە مردوون و باسی ئەو





جیـاوازییە کۆمەڵایەتییـانە دەکـات کە لە نێـوان منداڵانی چینی هەژارو دەوڵەمەندەکـاندا هەن، نووسەر لە بابەتەکانیدا پەنای بۆ وتەی زۆر لە نوسەرانی ناسراوی ئەدەب بردوە وک تۆڵستۆی، دیستۆیفسکی و تاگور و کەڵکی لە بیروڕاکانیان وەرگرتوە.
هەر وا ع. و. نوری بایەخێکی بەرز بە ڕۆڵی ئەدەبی منداڵان دەدا و ئاماژە بۆ گرنگێتی گەشەسەندنی تیۆریی پەخشانی تایبەت بە منداڵان دەدات.

## عەلادین سەجادی ١٩١٥-١٩٨٤

عەلادین سەجادی کەسایەتییەکی گەورەی مەیدانی ئەدەب و کۆمەڵایەتییە، سەرەڕای چەندان کتێبی مێژوویی و ئەدەبی و ئەتنۆگرافی و فۆلکلۆری کە لە کتێبخانەی کورددیدا بە سەرچاوەی بە پێزو دەوڵەمەند دادەنرێن. نووسینی تایبەت بە منداڵانیشی هەیە. کۆمەڵە چیرۆکێکی بەناوی هەمیشە بەهار لە چاپ داوە ئەم کتێبە لە ١٢ کورتە چیرۆک پێکدێ. شایەنی باسە کە یەکێک لەو چیرۆکانە چیرۆکێکی ئەندەرسۆنە کە بەدەستکارییەوە کردوویەتیە کوردی،.شەش چیرۆکی تریان سەرچاوە لە فۆلکلۆرەوە وەردەگرن.

چیرۆکێکیان ڕووداوێکی مێژوویی دەگێڕێتەوە و ئەوانی تریشی چیرۆکی کۆمەڵایەتین .
شایەنی باسە سەجادی گەلێک چیرۆکی میللی و بە شێوەیەکی ئاسان و ڕەوان کە بۆ منداڵان بگونجێ داڕشتوونەتەوە لە چیرۆکەکانیدا فەلسەفە بنچینەییەکانی فۆلکلۆر دەپارێزێ و زیاتر ناوەرۆکی خوو و ڕەوشتی قارەمانەکان بەرجەستە دەکات، گەشەسەندنی ڕووداوەکانی ناو چیرۆکەکە ئاسانن و بە زۆریش حیکایەتەکان بە ئامۆژگاری کۆتاییان پێدێ، لە یەکێک لە چیرۆکەکاندا باسی کۆمەڵە منداڵێک دەکات کە یاری دەکەن و پاشان دەبێتە شەڕیان و کەسێکی گەورە دەکەوێتە بەینیانەوە. پێیان دەڵێ ئێوە وەک گورگ و مەڕ، یاخود ڕێوی قەمچوغەوان. ئیتر منداڵەکان واز لە دەمەقاڵەکەیان دێنن و داوای لێدەکەن چیرۆکەکەیان بۆ بگێڕێتەوە و پاش گێڕانەوەی چیرۆکەکەش کۆمەڵێک ئامۆژگاری منداڵەکان دەکا.
زۆربەی چیرۆکەکانی لەگەڵ ئەوەی سەرچاوە لە فۆلکلۆرەوە وەردەگرن و پڕە لە گاڵتەجاری و

ڕەخنە، نووسەر هەندێ قارەمان و ڕووداوی نوێی تری تێهەڵکێش دەکات، کە پەیوەندییان بە مەسەلە سیاسییە هاوچەرخەکانەوە هەیە، نووسەر بە شێوەیەکی هونەرمەندانە ئەو ڕووداوانە تێهەڵکێش دەکات، بە شێوەیەک خوێنەر سنووری نێوان ڕووداوەکان نابینێ. بۆ نموونە چیرۆکی سێوەنگ و مام ڕێوی. لەم چیرۆکەدا منداڵێک بە ناوی سێوەنگ کتابێک دەربارەی کوردستان دەخوێنێتەوە و پاشان ناوەڕۆکی کتێبەکە کە سەبارەت کوردستان و خێرو بێری زەوی و بن زەوییە بۆ خوشکەکەی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: سەرنجی وڵاتەکەمان بدە کە چەند سامانی سروشتیمان هەیە. پێویستە وڵاتەکەمان خۆشبوێ. لێرەدا چیرۆکنووس سەرنجی منداڵان بۆ جوانی و خۆشەویستی وڵاتەکەیان ڕادەکێشێ..

ئەم چیرۆکە بە زمانێکی ڕەوان و ساکار و ڕستەی کورت و کوردییەکی پەتی نووسراوە، سەجادی لە چیرۆکەکانیدا خۆشەویستی و بە تەنگەوە هاتنی نیشتمان و وڵاتپەروەری لای نەوەی نوێ کردوەتە ئەرکی سەرەکی خۆی، هەروا سەجادی بایەخێکی گەورەی بە ئەدەبی تایبەت بە منداڵان داوە. پەنا بردنیشی بۆ فۆلکلۆر و دەوڵەمەندکردنی ناوەڕۆکی چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان کارێکی بەرێکەوت نەبووە، بەڵکو بە شێوەیەکی هۆشمەندانە بیرۆکەی ئەو چیرۆکە فۆلکلۆرییانەی دارشتوەتەوە کە منداڵ بە ئاسانی لە مەبەستەکەی بگات.

## نەجمەدین مەلا

نەجمەدینی مەلا نووسەرێکی ترە کە بەرهەمی بۆ منداڵان هەیە. ئێمە لێرەدا هەوڵ دەدەین سەرنجی داهێنانی پەخشانەکانی بدەین. ئەو مامۆستاو وەرگێرو شاعیرێکی بە بەهرە بووە.

ساڵی ١٨٩٨ لە شاری سلیمانی لە دایک بوە، چووەتە بەر خوێندن و لە تەمەنی چواردە ساڵیدا چووەتە حوجرە. لە ساڵی ١٩٢٦ وە دەستی بە بڵاو کردنەوەی بەرهەمەکانی لە گۆڤاری زاری کرمانجیدا کردوە. ئاوارە لە پێشەکی کتێبەکەی (کەشتی نوح) ی نەجمەدینی مەلادا نووسیویە: "نجم الدین مەلا لەم کۆمەڵە چیرۆکەیدا چەند چیرۆکێکی وەرگێراوەتە سەر زمانی کوردی و مۆرکێکی کوردەوارییانەی پێ بەخشیون و لە هەمان کتێبدا کۆمەڵێک چیرۆکی تری فۆلکلۆری بڵاو کردوەتەوە" "٥٣"

ڕەخنەگران بە چەشنێکی بە نرخ و پڕ بایەخەوە سەرنجی داهێنانەکانی ئەم نووسەرەیان داوە و





لەو بەرهەمانەی کۆڵیونەتەوە کە لە ڕۆژنامەی ژیاندا بڵاو کراونەتەوە. "٥٤"

بە دەگمەن بەرهەمێکی نجمەدین مەلا دەبینرێ گیانی پەروەردەییانەی تێدا نەبێ. لە چیرۆکەکانیدا منداڵان فێری کاری چاک دەکا و لە درێوی و چاو چنۆکی و درۆ و ستەم هوشیاریان دەکاتەوە و داوایان لێدەکا کە درێژە بە ڕێڕەوی دڵسۆزانەی باوو باپیرانیان بدەن و ڕووبکەنە خوێندن.

مستەفا نەریمان لە ڕەخنەکەیدا ئاماژەی ئەوە دەکا چیرۆکەکانی نەجمە دینی مەلا گەرچی بەزمانی گەورە نووسراون بەڵام لە ناوەرۆکدا دەچێتەوە سەر ئەدەبی منداڵان لە شێوەی ئەو حیکایەتانەدا دارێژاون کە لە شەوانی زستان و. لە گوێ ئاگرداندا لە لایەن داپیرەو کەسانی گەورەوە بۆ منداڵان دەگێڕدرێنەوە منداڵان بۆ تێگەیشتنی ئەو چیرۆکانە پێویستیان بە یارمەتی گەورە نییە.

چیرۆکی (چاکە بکە و بیدە بە ئاوا) باسی قوتابییەک دەکا بە ناوی شاباز، ئەم منداڵە زیرەک و بە توانا دەبێ و مامۆستاکەی دەزانێ کە دوارۆژێکی سەرکەوتوو و گەشی دەبێ، هەر بۆیە مامۆستاکەی بەبێ هۆ و بە ئەنقەست جارێکیان لێیدەدا، ئەم کارەش وای لەشاباز کرد ڕق ئەستووری لە دڵیا سەر هەڵبدا بەرامبەر بە مامۆستاکەی و بیر لە تۆڵە سەندن بکاتەوە، بۆیە بە مامۆستاکەی دەڵێ بۆ وات لێکردم مامۆستاکەی لە وەڵامدا دەڵێ: ئەو سزایەم دایت ئەویش جۆرێکە لە وانەی قوتابخانە، چونکە من خۆشمئەوێیت و ویستم سەرنجت بۆ ئەوە ڕاکێشم کە بێویژدانی و چەوساندنەوە و ناحەقیش هەیە، بۆ ئەوەی لە دوا ڕۆژدا کە گەورە دەبی بزانی چۆن مامەڵە لە گەڵ خەڵکدا بکەیت و بزانی کە تەشقەڵەو ناحەقی چ کارێکی خراپی دەروونی دەکەنە سەر خەڵک و خۆت لێیان بپارێزی.

ئاکام شاباز سوپاسی مامۆستاکەی دەکات و دیارییەکی بە نرخی بە دەداتێ و لە کۆتاییشدا نووسەر ئەم چەند دێرە شیعرەی هێناوەتەوە:

تۆ چاکە بکە و بیدە بە ئاوا
با خەڵک نەزانێ لای خوا نووسراوە

نەجمەدینی مەلا گەرچی بە هەژاری دەژیا. لە کارو بەرهەمەکانیداو بەکردەوەش لایەنی

خەڵکی ڕەشوڕووتی دەگرت، لە هەمان کاتدا ڕقێکی ئەستووری بەرامبەر بە هەژاری و دەستکورتی هەبوو و بە سەرچاوەی گەلێ نەخۆشی دادەنا و بە کۆسپێکی جیدی دەزانی لە بەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵدا.

لە چیرۆکێکی تری بە ناوی (هەژاری چاوتێر و دەوڵەمەندی چاو چنۆک).

لەم چیرۆکەی دا باسی کابرایەکی هەژار دەکا کە دراوسێی میری بابان دەبێ. ئەم کابرایە جگە لە قازێک شتێکی تری شک نەبردووە ئەویشی سەر بڕیوە و بە سوورەوە کراوی پێشکەش بە میری کردوە، کاتێکیش قازەکەی بردووە پێ ی گوتووە ئەمە دوایەمین قاز و سامانیەتی، پاشاش لە وەڵامدا پێی دەڵێ: سوپاس بۆ دیارییەکەت و دەبێ بە سەر خۆماندا کە حەوت کەسین دابەشی بکەین، من و ژنەکەم و دوو کوڕو دوو کچەکەم تۆش حەوتەم دەبێ.

کابرای هەژار بە شێوەیەکی وا ژیرانە قازەکەی دابەشکرد بەسەر هەمووداندا کە پاشا زۆر دڵشاد بوو بە زیرەکی هەژارو فەرمانی دا دوو تەغار برنج و گەنم و پەنجا لیرەی زێڕی بدەنێ.

دواتر چیرۆکنووس باسی دەوڵەمەندی چاو چنۆک دەکا کە دراوسێی کابرای هەژار دەبێ و ناوی ئەربابە. کابرای دەوڵەمەند پێنج قاز پێشکەش بە میر دەکا و چاو چنۆک قازەکانی دابەش نەکرد. بۆیە پاشا بانگی ئەرباب دەکا تا قازەکان بە سەر خێزانە شەش ئەندامیەکەیدا دابەش بکات. ئەرباب قازێکی لە بەردەم پاشا و هاوسەرەکەی دانا و وتی ئێوە دوو کەس ئەمەش قازێک، قازێکی لە بەردەم هەردوو کوڕەکە داناو بە هەمان شێوە قازێکی بۆ هەردوو کچەکەی پاشا دانا. پاشان دوو قاز مایەوە، هەڵیگرت بۆ خۆی. وتی من و دوو قاز ئەبین بە سێ.

پاشا ڕووی کردە کابرای دەوڵەمەندو وتی. تۆ دەوڵەمەندێکی پیسکەی بەخیلی لەگەڵ ئەوەشدا بێ ئەقڵ و نەزانی، ئەبێ پارەی جریمە بدەی و مانگێکیش حەپس بکرێیت.

لە چیرۆکێکی تری دا بە ناوی دوژمنی زانا و دۆستی نەزان، باسی باخەوانێک دەکا کە دۆستایەتی لە گەڵ ورچێکدا پەیدا دەکا و ورچەکەش باخەکەی بۆ دەپارێزێ، چیرۆکنووس لێرەدا قارەمانێکی تری خستوەتە ناو چیرۆکەکەوە کە ئەویش مارە، مارەکە بیر دەکاتەوە بە کابرای باخەوانەوە بدا. ئەنجام مارەکە ئەم کارە ناکا چونکە دەزانێ ئەم کارە ڕووبەڕووی مەترسیی دەکاتەوە و بە زیانی خۆی تەواو دەبێ. بەڵام دۆستە نەزانەکەی ڕۆژێک دەبینێ کابرای باخەوان





نووستوە و مێشێک بە سەر ڕومەتیەوەیە، چەپۆکێکی گەورە دەهاوێ بە نیازی دوور خستنەوەی مێشەکە لە کابرا، بەڵام ئاکام ئەو چەپۆکە کە بەر کابرا دەکەوێ دەیکوژێ و دەمرێ.

لێرەدا نەجمەدینی مەلا ئەم بابەتەی بەم شێوەیە داڕشتووە و تێکەڵ بە جیهانی ئاژەڵ و گیانلەبەرانی کردوە، چونکە زانیویەتی ئەم جۆرە نووسینە زیاتر سەرنجی منداڵ ڕادەکێشێ.

لە چیرۆکێکی تریدا بە ناوی (جوتیاری زیرەک و نەخوێندەوار) . باسی هەڵسوکەوتی ماقوڵ و زیرەکانەی مرۆڤ و باسی ستەم و خراپی کەسانی چەپەڵ دەکا، لە چیرۆکی (ئەنجامی پەلە ) شدا سەرزەنشتی منداڵان دەکا کە لە سەرخۆ و هێمن بن و لە ئەنجامدانی ئەرکەکانیاندا پەلە نەکەن. لە هەمان چیرۆکدا باسی بڵحی و چاو چنۆکی دەکا لەبەر ئەوەی نەخۆشیەکە مرۆڤ بەرەو فەوتان دەبا.

( گەڕو گێچەڵ سەر ناگرێ) چیرۆکێکی ترە، تیایدا باسی کابرایەک دەکا کە پارەیەکی زۆر دەدۆزێتەوە، قارەمانی چیرۆکەکە دەیەوێ ئەم پارەیە بۆ خاوەنەکەی بگێڕێتەوە و هەوڵی دۆزینەوەی دەدا، بازرگانی خاوەن پارەکەش ئەوە ڕادەگەیەنێ کە هەزار لیرە بەخشیش دەدا بە هەر کەسێک ئەو پارەی دۆزیبێتەوە و بیگێڕێتەوە. بەڵام کابرای بازرگان کە کابرایەکی ساختەچی و چاو چنۆک دەبێ، کاتێ کە کابرای کۆڵهەڵگر پارەکەی بۆ دەباتەوە یەکسەر لە زیندانی توند دەکا و بەوە تاوانباری دەکا کە ئەم بیست و یەک هەزار لیرەیەی لێ دزیوە، کاتێکیش کابرای کۆڵهەڵگر لە زیندانەوە سکاڵایەک بۆ کەریم خانی زەند دەنێری و ڕووداوەکەی بۆ باسدەکا، کەریم خان بڕوا بە کابرا دەکات و بڕیارێک دەر دەکا کە کابرای بازرگان بۆ کۆشکی میر بێنن و فەرمانی بە بازرگانەکە دا کە پارەکە بۆ کابرای کۆڵهەڵگر بگێڕێتەوە. بازرگان پارەکە دەردێنێ و دەڵێ: ئەم جیزدانە بیست و یەک هەزاری تێدابوو، واتە هەزاری ناتەواوە. کەریم خان پارەکەی لێوەردەگرێ و دەیداتە کابرای کۆڵهەڵگر و دەڵێت: ئەم پارەیە هی تۆیە. ، چونکە پارەی بازرگانەکە ئەوەندە نەبوو. با خۆی بچێ بۆی بگەڕێ.

ئەگەر چی چیروکەکانی نەجمەدینی مەلا لە ڕووداو و بابەتی جیا جیا دەکۆڵنەوە بەڵام لە ناوەرۆکدا چیرۆکەکانی تریشی باسی لایەنی ئەخلاقی دەکەن و ئەو کارە چەپەڵ و دزێوانە ریسوا دەکەن کە لە مرۆڤدا هەن و بۆ کاری چاک و پەسەند خەڵک هاندەدا.

## شـــاكر فەتاح

شاكر فەتاح لە ساڵی ١٩١٤ دا لە دایكبووە بە نووسەر و رۆژنامەنووسێكی بە توانا دادەنرێ. شێوازی هەمە چەشنەی ئەدەبی و فەرهەنگی پەیڕەوكردووە. لەماوەی چل ساڵی داهێناندا گەلێك بەرهەمی بەهاداری پێشكەش بە گەلەكەی كردووە. بایەخدان بە زمانی كوردی و كاركردن بۆ پێشخستنی ئەم زمانە یەكێك بووە لەكارە بەرچاوەكانی ئەم نووسەرە.

بە پیشەی مامۆستاییەوە خەریكبووە و ژمارەیەك كتێب و نامیلكەی دەركردووە.

شاكر فەتاح یەكێك بوە لەو نووسەرانەی كە رەوتی رۆمانسیەتی لە كاری ئەدەبیدا پەیڕەو كردوە، كە لەو دەمەدا قوتابخانەیەكی بەربڵاو بووە لە ئەدەبی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. نووسەر بیرو بۆچوونی رۆشنكارانەی هەبووە بۆ گۆڕینی كۆمەڵ، بۆ ئەمەش بڵاو كردنەوەی زانیاری و خوێندەواری و بەهێز كردنی ئاستی رۆشنبیری خەڵكی بە باشترین رێگا و كاریگەرترین چەك زانیوە كە كۆمەڵگە بە پێشكەوتن و بەختیاری دەگەیەنێ. لە ساڵی ١٩٤٧دا كۆمەڵێ چیرۆكی بە ناونیشانی (شەبەنگە بە رۆژ) بڵاو كردوەتەوە كە لە ١٠ چیرۆك پێكدێ وهەشتیان لە ساڵی ١٩٤٣ تا ١٩٤٦ لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاو كراونەتەوە، چیرۆكەكانی لەو دیاردە و بابەتانەوە هەڵقوڵاون كە لە ژیانی كۆمەڵگەی كوردەواریدا مەسەلەی رۆژانە بوون، لە گشت ئەم چیرۆكانەشدا نووسەر هەڵوێستی شەخسیی خۆی بەراشكاوی دەربڕیوە. لەم چیرۆكانەیدا باسی كارمەندی بەرتیلخۆرو مامۆستا نەزانەكان دەكا. هەروا باسی چەپەڵی ئەو كەسانە دەكا كە لە نەزانینەوە بیرتەسكن و دواكەوتوویی كۆمەڵایەتی بە سەریاندا زاڵە، هەر لە ناونیشانی چیرۆكەكانیشیەوە دەتوانرێ سەرنجی ئەوە بدرێ كە نووسەر مەیلێكی گاڵتەجاربیانەی هەبوە. وەك (سەرۆكی بە رێز مام شێخ...هتد)

یەكێك لە چیرۆكاكانی ئەم كتێبە (چۆن گرامە فۆنەكەم كڕی) لە لایەن دوكتۆر مارف خەزنەدارەوە كراوە بە ڕووسی. لە چیرۆكی (مامۆستاو گۆرانی بێژ)، باسی مامۆستایەك دەكا كە دڵڕەق و قسەووشك و مامەڵەی لەگەڵ قوتابیاندا خراپ بووە..

دوو قوتابی لەو باوەڕەدان كە ئەم مامۆستایە ناچار بكەن رێزیان لێبگرێ، لە مامەڵەیدا نەرم بێت لە گەڵ قوتابیاندا، ئێوارەی رۆژێكی جومعە ئەم دوو قوتابیە بڕیار دەدەن ئاهەنگێكی





گۆرانی سازكەن، ئەگەرچی دەنگخۆشیش نەبوون، بەڵام بە دەنگێكی بەرز دەستیان بە گۆرانی و كەمانچەژەندن كرد. مامۆستەكەیان كە لە ژووری تەنشتیانەوە دەژیا هیچ كارێكی پێنەكرا. ئەوە شەوە مامۆستاكە نەیتوانی پشووش بدات. لە هاتو هاواری دەنگی بەرزی مۆسیقا و گۆرانییەكانی ئەوان هەراسان بوو، لە گەڵ ئەوەشدا هیچی پێ نەدەكرا چونكە رۆژی حەسانەوەی قوتابیان بوو.

ئاكام مامۆستاكە بۆی دەردەكەوێ كە ئەم ئاهەنگە ساز كراوە بۆ تۆڵە سەندنەوە لە هەڵسوكەوتە نابەجێكانی ئەو لەگەڵ قوتابیاندا، بۆیە بڕیار دەدا هەر چۆنێك بێت پەیوەندییان پێوە بكاو زمانێكی هاوبەشیان لە گەڵدا بدۆزێتەوە و خۆی لە گێچەڵی لەم چەشنە لە داهاتوودا بپارێزێ. بەم جۆرە مامۆستا و قوتابیەكان رێكدەكەون و ئاشتی دەكەوێتە نێوانیانەوە.

بابەتی پەروەردە و قوتابخانە و ژیرێتی قوتابی و پەروەردە كردنی نەوەی نوێ، بابەتی گرنگ و بەپەلەن لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا شوێنێكی تایبەتیان لە ئەدەبی ئەو گەلانەدا هەیە، چونكە سیاسەتی خوێندن و كارو باری قوتابخانە لەو وڵاتانەدا روبەڕووی گەلێك كارو تەنگوچەڵەمە دەبن. نزمی ئاستی مامۆستایان و خراپ ئامادە كردنیان، ئاست نزمییان لە باری رۆشنبیرییەوە لە ساڵانی(٢٠ تا ٤٠) ەكانی سەدەی بیستەم كارێكی خراپی كردبووە سەر باری خوێندن. گاڵتە كردن بە قوتابیان كارێكی رۆژانەی ناو قوتابخانەكان بوو، هەر بۆیە چیرۆكنووس ئەوەی بڵاوكردوەتەوە كە پێویستە یەكێتییەكی پڕ لە رێزو خۆشەویستی لە نێوان قوتابی و مامۆستادا هەبێ بۆ ئەوەی بارێكی ئاسایی لە دامەزراو و خوێندنگاكانداهەبێت. شاكر فەتاح لەگەڵ ئەو رۆڵەی لە گەشەكردنی ئەدەبی كوردی دا هەیبوە، رۆڵێكی بەرچاویشی لە ئەدەبی تایبەت بە منداڵاندا گێڕاوە.

كتێبی (هاوڕێ ی منداڵ) كە ساڵی ١٩٤٨بڵاوكراوەتەوە، یەكێكە لە بەرهەمە بە پێزەكانی، كە كۆمەڵێ چیرۆكی گرتوەتە خۆی و تایبەت بە منداڵان و لاوانە. هەر لە بەرگی ئەو كتێبەوە ناوەرۆكی چیرۆكەكانیان دەردەكەوێت كە دەڵێت: هاوڕێی منداڵ خوێندنەوەیەكی نوێیە بە ئامانجی پێگەیاندنی منداڵانی كوردە، لە سەر بنچینەیەكی زانست و هونەر و گیانی نیشتمانپەروەریی.

**بەشی چوارەم**

## چەند تێبینییەک

لە مێژ نییە ئەدەبی منداڵان وەک بەشێکی سەربەخۆی دانەپچڕاو لە ئەدەبی جیهانیدا سەریهەڵداوە.

ساڵانێکی زۆر بەرهەمی هونەری و کتێبی تایبەت بە منداڵان سەرنجی پێویستیان نەدەدراو، بەئەدەبێکی بچووک و بێبایەخ لەقەڵەم دەدرا و سنووری حیکایەتی گیانلەبەران و چیرۆکی کۆن و ئامۆژگاری کردنی نەدەبەزاند. بەزمانێکی وشک و تەختەیی دەنووسرا. بەڵام لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە لە ئاکامی کۆششی ژمارەیەک نووسەران و ڕەخنەگرانی ڕۆژئاوا و ڕووسیا سەرنجی ئەدەبی منداڵان درا و وەک بابەتێکی سەربەخۆ لە چوارچێوەی ئەدەبدا بە گشتی هاتە بەر باس.

مێژوو ئەوە ڕووندەکاتەوە کە سەرهەڵدان و گەشەسەندنی ئەدەبی منداڵان پەیوەندی بە ئاستی پێشکەوتنی نەتەوایەتی - کۆمەڵایەتی و ئابووری- کۆمەڵایەتییەوە هەیە. بە شێوەیەکی گشتی ئەدەبی ڕاستەقینەی منداڵ لەگەڵ هەرەسی دەرەبەگایەتی و داهاتنی سەردەمی بۆرژوادا سەرهەڵدەدا. پەیدا بوونی بیرو ڕای ڕۆشنکاری زەمینەی پەرەسەندنی ئەدەب و سەرهەڵدانی ئەدەبی هاوچەرخی منداڵانی پێکهێنا. بە هەراوی خوێندەواریی بڵاوکردەوە بە بەراورد لەگەڵ قۆناغەکانی ڕابردوودا، بەڵام لەسەرەتادا ئەدەبی منداڵان زیاتر ئەو بەرهەمە فۆلکلۆرییانە بوو کە لە کتێبی قوتابخانەکاندا هەبوو، یان لەو بابەتە تایبەتییانەی کە ڕێنوێنی منداڵان و میرمنداڵانیان دەکرد و بە زۆریش بەرهەمی شیعری بوون و زیاتر مەیلی ئامۆژگارییان پێوە دیاربوو. واتە پتر ئەو بەرهەمانە بوون کە بۆ قۆناغی هەوەڵی پەروەردەکردنی منداڵ پێویستن. ئەدەبی منداڵانی کورد بە شێوەیەکی گشتی ئەم قۆناغەی تێپەڕاندوە و بابەتی نوێ و هاوچەرخ تێکەڵی ئەم ئەدەبە بووە، بەڵام هێشتا کەم و زۆر نووسەری وا هەن هێشتا لە چوارچێوەی فۆلکلۆرو حیکایەتە کۆنەکاندا چیرۆک و بەرهەم بۆ منداڵ دادەهێنن.

ئەو هەل و مەرجە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییە ئاڵۆزانەی باڵیان بە سەر ژیانی گەلی کوردا کێشاوە و چەوساندنەوەی لە ڕادەبەدەر و نەگەیشتنی ئەم گەلە بە سەر بەخۆیی و پێکهاتنی دەوڵەتی نیشتمانی وایکردوە کە دامو دەزگای نیشتمانیی ئەوتۆ نەبن تایبەت بە ڕۆشنبیری و





ئەدەبیی بەگشتی چجای ئەدەبی منداڵان، لە هەندێ بەشی کوردستاندا منداڵانی کورد بە زمانی زگماک ناخوێنن یان هیچ چاپەمەنی و بڵاوکراوەو دەزگایەک لە ئارادا نین، چۆن دەکرێ باسی پەرەسەندنی ئەدەبی منداڵان بکرێ، بەڵام لە باشووری کوردستاندا لە ئاکامی تێکۆشانی گەلی کورد و بە دەستهێنان و چەسپاندنی کۆمەڵێک دەستکەوتی ڕۆشنبیری لە قۆناغە جیا جیاکاندا، وەک خوێندن بە زمانی کوردی و بوونی گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاو کردنەوەی کتێب و بەرنامەی رادیۆ و کەناڵی تەلەڤزیۆن. لە ئاکامی ئەم هەلو مەرجەدا گەلی کورد بە گشتی و ڕۆشنبیرانی کوردستان بە تایبەتی توانیویانە پەرە بە زمان و ئەدەب و ڕۆشنبیری کورد بدەن و لەم چوارچێوەیەشدا ئەدەبی منداڵانی کورد پەرەی سەندوە و لە گەشەکردنی بەردەوامدایە.

بەرهەم و چیرۆک و حیکایەتە فۆلکلۆرییەکان، یان ئەوانەی پاشتر کە سەرچاوە لە جیهانی فۆلکلۆرەوە وەر دەگرن و باسی خێرو شەڕو خۆشویستنی نیشتمان و ڕەوشت پاکی ...هتد دەکەن و بوونەتە زەمینەیەکی دەوڵەمەند بۆ ئەدەبی منداڵانی کورد. لە ساڵی ١٩٧٠ بە دواوە ئەدەبی منداڵانی کورد دەکرێ بگوترێ لەڕووی روخسارو ناوەڕۆکەوە پێی ناوەتە قۆناغێکی تازەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو بەرهەمانە وەک کتێب و سەرچاوە لەبەردەستدا نین، جگە لە هەڵسەنگاندنێکی گشتی ناتوانین باسی وردەکارییەکانیان بکەین، بەڵام ئەوەی کە دەکرێ لێرەدا پێی لەسەر داگرین ئەوەیە کە هێشتا چیرۆکی درێژو ڕۆمانی تایبەت بە منداڵان لە ئەدەبی کوردی دا سەریهەڵنەداوە ئەمەش بۆ ئەو هۆکارانە دەگەڕێتەوە کە تەواوی گەلی کورد و بزوتنەوەی ڕۆشنبیری دوچاری بوو. لە هەمان کاتدا دەکرێ ئاماژەی ئەوەش بکرێ کە ڕەخنەیەکی تۆکمەو زانستیانەی ئەدەبی منداڵان بە ڕوونی بەرچاو ناکەوێ.

هەروا دەکرێ بڵێین ئەو نووسەرو هونەرمەندانەی کە لە بواری ئەدەب و هونەری منداڵانی کوردا کار دەکەن یان بەشێکی بەرهەمەکانیان بۆ منداڵان تەرخانە، پێویستە سەرنجی ئەو ئاستە ئەدەبی و زانستیەی ڕۆشنبیریی منداڵانی جیهان بدەن و بە قووڵی بچنە ناو ئەو جیهانەی منداڵانی دنیاوە، کە پڕ لە بەرهەمی داهێنەرانەی ئەدەبی و زانستییە بەگشت لقەکانیانەوە، لە هەمان کاتدا کەڵکی تەواو لە ئەدەبی منداڵانی ڕۆژهەڵات وەرگیرێ.

وەک پێشتر وتمان گەلی کورد خاوەنی فۆلکلۆرێکی دەوڵەمەند و بەر بڵاوە کە پڕە لە بابەتی جۆر بە جۆر بۆ منداڵان ئەمەش پێویستی بە خڕ کردنەوە و ریزبەندی و چاپکردن هەیە، چونکە ئەدەبی هاوچەرخی منداڵانی کورد سەرەڕای کەڵک وەرگرتنی لە ئەدەبی جیهانیی منداڵان و پێشکەوتنی ئەوڕۆی مرۆڤایەتی دەبێ ڕەگ لە زەمینەی میللی خۆیەوە بگرێ.

گەلێک خاڵی گرنگ لەم بوارەدا هەن کە دەتوانین ئاماژەیان پێبدەین. تەنیا تواناو بەهرەی ئەدەبی بەس نییە بۆ ئەو نووسەر و ئەدیبانەی کە تایبەت یان هەندێ لە بەرهەمەکانیان بۆ

منداڵان تەرخان کردوە، بەڵکو پێویستە خاسیەتی منداڵان لە هەر قۆناغێکی دیاریکراوی تەمەنیاندا بزانن و شارەزاییان لە سایکۆلۆژیای منداڵ بە گشتی و زانستی خوێندن و پەروەردەییدا هەبێت.

ئەدەب و رۆشنبیری منداڵ کاتێک پەرە دەگرێ و گەشە دەستێنێ کە پەیوەندییەکی بەردەوام و راستەوخۆ لە نێوان نووسەران و منداڵاندا هەبێ.

دەتوانین بڵێین رۆژنامەگەری منداڵان لە کوردستاندا نییە ئەوەیشی کە هەیە ئەو رۆژنامەو گوڤارانەن کە ماوە نا ماوەیەک لاپەڕەیەک یان گۆشەیەکیان بۆ منداڵان تەرخانکردووە، بەڵام نەیانتوانیوە ئەم تاقیکردنەوانەی خۆیان پەرەپێبدەن و رۆژنامە یان گۆڤارێکی تایبەت بۆ منداڵان دەربکەن.

ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی کە بۆ منداڵانن، دەبێ چاپێکی جوان و رەنگاوڕەنگ و تایبەت بکرێن و وێنەو نیگاری گونجاوو ئامانجگر لەگەڵ بابەتەکاندا بڵاوبکرێنەوەو بە ژمارەی زۆرو بە نرخی گونجاو بفرۆشرێن.

ئەدەبی جیدی و ئایندەڕوونی منداڵان پێویستی بە نووسەری پسپۆڕو ڕاستەقینەو خاوەن بەهرە هەیە. رەخنەگری ڕووسی دەبرەلوبۆف دەڵێ: "نووسین بۆ منداڵان بە هیچ جۆرێک کارێکی ئاسان نییە، نووسەری باش و راستگۆ بە ئەدەبی منداڵان پێویستی بە (بەهرەیەکی تایبەتییە) "٥٥" محاڵە ئەم بەهرەیە لای کەسێک سەرهەڵبدا ئەگەر لە دڵەوە خۆشەویستییەکی قووڵی بۆ منداڵ نەبێ یان ئەگەر لە تایبەتمەندییە زۆر ناسک و سەرنجڕاکێشەکانی منداڵان تێنەگا. نووسەری منداڵان دەبێت توانای ئەدەبی هەبێ و خەیاڵی منداڵان بۆلای خۆی راکێشێ و وەڵامی خولیاو مەیلەکانیان بداتەوە و رێگایان بدا ئازادانە ئەو مەیلە پەلکە زێڕینانە دەربڕن. منداڵ زیاتر بڕوای بە ژیانی سەرسوڕهێنەر و داستاناوی هەیە، دەشتوانێ هەموو دەمێک ئەم ژیانە بۆ خۆی پێکبێنێ. دەبێ نووسەر هەوڵی گەشەسەندنی ئەم توانایە لە منداڵ دا بدا و ئارەزووی ژیانێکی ئازادو دادپەروەرانە و بەختەوەرانەی لا بوروژێنێ، ئەم کارەش هەروەک بیلنیسکی دەڵێ "- عەقڵێکی دەوڵەمەند و بە پێز- دەخوازێ نەک واهیمە. ئەم کارە پێویستی بە خەیاڵێکی زیندوو و بە توانای ئەوتۆ هەیە کە بتوانێ ژیان بە زیندوویەتی و فرە رەنگی بخاتە ڕوو-" "٥٦" بەداخەوە هێشتا ئەم تێزو بۆچوونانە لە ناو ئەو نووسەرانەدا کە بۆ منداڵانی کورد دەنووسن کەم بەرچاو دەکەوێ.

لێرەدا دەتوانین ئاماژەی هەندێ کەموکووڕی بە کورتی بکەین کە لەبەرهەمی بەشێک لەو نووسەرە کوردانەدا بەر چاو دەکەون کە بۆ منداڵان دەنووسن.

- لە بەشێک لەو چیرۆکانەداڕووداوەکان بە شێوەیەکی زۆر ساکار بەڕێوە دەچن و قارەمانی





چیرۆکەکان ئاڕاستەیەکی راستەوخۆ دەکرێن و گیانی هەڵچوون و دەربڕین و بیرکردنەوەی ئازاد لای منداڵ دروست ناکات. ناتوانن منداڵەکە بۆ ناو رووداوەکە راکێشن و بیکەنە لایەنێک یان خاوەنی ڕووداوەکە. بۆ نموونە با سەرنجی ناوەڕۆکی چیرۆکێک بدەین: (شێرزاد بە ڕێگادا کە بۆ قوتابخانە دەڕوا پێنوسێک دەدۆزێتەوە هەڵیدەگرێ و دەیخاتە گیرفانییەوە لە پۆلدا کاتێک کە وانەی خوێندن دەست پێدەکا هەڵئەسێ و باسی دۆزینەوەی پێنووسەکە دەکا و مامۆستاکەش ئامۆژگارییەکی بچووک دەگێڕێتەوە و ئافەرین لە شێرزاد دەکا و برادەرەکانیشی چەپڵەی بۆ لێدەدەن و پەیمان دەدەن کە ئەوانیش نموونەی شێرزاد بن.

سەبارەت بەم جۆرە چیرۆکانە بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە وتەیەکی بیلینسکی بدەم کە دەڵێ:

ئەم جۆرە کارانە منداڵ فێری ئەوە ناکەن هەستی جوانیناسییان لا پەیدا بێت و بیر لە کاری ئەخلاقی بە سوود بکەنەوە بەڵکو زیاتر فێری ئەوەیان دەکا ببنە ئامۆژگاریکارو مرۆڤێکی ئاراستەکراو، یان ئاراستەکار. ئەو ئامۆژگاریکەرە چاکانەی کە لەو چیرۆکانەدا هەن بە شێوەیەکی هونەری سەرکەوتوو ناخرێنە ڕوو."٥٧"

بۆ نموونە کۆمەڵە چیرۆکی (گڕوگاڵ)ی عباس محمد حسین بوێرانە خۆی لەو باسە گرنگانە داوە، بەڵام بە هۆی وشکی زمان و دارشتن و، ئەو ئامۆژگارییە بێتامانەی کە لە دوو توێی چیرۆکەکاندا هاتوون، منداڵ تاقەتی خوێندنەوەو تێکەڵبوونی چیرۆکەکانی زۆر نابێ. ئەم تێبینییە سروودی شادی کۆمەڵە چیرۆکی کەماڵ محمدیش دەگرێتەوە.

٢- بەشێک لەو نووسەرانەی کە بۆ منداڵان دەنووسن بۆ ئەوەی ریالیستانەو ئاسان ڕووداوەکان ئاوێنە بکەنەوە تووشی ساکارییەکی بێتام و گێژاوی گێلێتی دەبن، بۆیە زۆر چیرۆکمان بەر چاو دەکەوێ کۆمەڵێ وشەی منداڵ و پشیلە و چۆلەکەی هێناوە و ژمارەیەک بانگەوازی قەبەو زلی تێئاخنیوە و ناوی چیرۆکی لێناوە.

پێویستە نووسەرانی منداڵان ئەو ڕاستیە باش بزانن کە دەرکی منداڵان زۆر سروشتی و ئاساییە و هەر ئەمەش بوەتە هۆی ئەوەی بۆ فێربوونی زیاتر، بێ ئۆقرە هەوڵدەدەن. تەنانەت منداڵ لە هەندێ ڕووەوە لە کەسانی گەورە زووتر هەست بە ساختەو درۆ دەکەن. ئێستا بێجگە لەمەتەڵ و حیکایەتی داپیرە وگوێ ئاگردان ناتوانن حەزو ویستی منداڵ تێر بکەن و خەون و پرسیارەکانیان وەڵام بدەنەوە. ئێستا منداڵ رۆژانە گوێ لە رادیۆ دەگرێ و سەیری تەلەڤزیۆن دەکا [ئەمە جگە لە کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت و دەیان چەشنە سیستەمی فێربوون و زانیاری وەرگرتن و یاریی ئیلکترۆنی] لە ڕۆژگاری ئێستادا شێوەی دەرککردن و فێربوون و ناسینی واقیع نەک هەر بۆ کەسانی گەورە ڕەخساوە، بەڵکو بۆ منداڵانیش لە ئارادایە.

هەندێ نووسەریش جۆرە بابەتێکی وا بۆ چیرۆک و بەرهەمەکانیان هەڵدەبژێرن کە پڕە لە ڕووداوی

قورس و ئالۆزی ئەوتۆ کە بۆ کەسانی گەورەش بە ئاسانی شیناکرێتەوە چجای منداڵ، ناتوانن
بچنە ناو مێشک و دەروونی منداڵ و شتێکی فێر ناکەن کە چاوەڕوانی دەکا و زۆر جاریش
لەو نووسینانەدا جیاوازی لە نێوان تەمەنی منداڵاندا ناکرێت و بەیەک زمان و یەک شێوە بۆ
منداڵی دە ساڵان و سیانزە ساڵان چوارده ساڵان دەنووسرێ.

٣- ژمارەیەکی تر لە نووسەران بەبێ خۆ ماندوو کردن و گەڕان و وەستاکارییەک لە
بەرهەمەکانیاندا پەنا بۆ ئەو ڕووداوە داستانی و کۆنانە دەبەن کە شوێنی دیاریان لە ئەدەبی
گەلانی دنیادا گرتوەتەوە و بەبێ ئەوەی گیانێکی تازەیان پێ ببەخشن یان خاسیەت و
ڕەسەنایەتی نەتەوایەتی بەبەردا بکەن.

بۆ نموونە حیکایەتی بزن و مەڕ، ڕێوی و کەڵەشێر، ...هتد لە بەرهەمی چەند نووسەرێکدا دەبینی
کە پێش وەخت بڕیاری ئەوەیان داوە کە ڕووداوەکان بە چ سەمتێکدا بڕۆن و بەشێوەیەکی
یەکلاکەرەوەش ڕۆڵی پۆزەتیڤ یا نێگەتیڤی قارەمانەکانیان دیاری کردووە، هەر بۆیە گەلێک
جار ئەو چیرۆکانەی باسی بزن و گورگ دەکەن زیاتر لە نووسەرێک پەنای بۆ دەبا و بەبێ
دەستکارییەکی جیدی و هونەری تێکەڵ بە بەرهەمەکانی خۆی دەکا و بلاویان دەکاتەوە، هەر
بۆ نموونە چیرۆکی بزن و گورگ زیاتر لە چیرۆک نووسێک لە فۆلکلۆرەوە وەریانگرتوە و بەبێ
هیچ داهێنانێکی هاوچەرخانە لە سەردەمێکەوە گواستوویانەتەوە بۆ سەردەمێکی تر.

٤- گەلێک جاریش ئەو بەرهەمانەی کە لە کەلەپووری میللییەوە وەردەگیرێن بەبێ ساغکردنەوەو
لێوردبوونەوەو لێتۆژینەوەیەکی زانستیانە، ئەو مەتەڵ و حیکایەتە داستانی و پڕوپوچانە لە
زارەوە وەر دەگێڕێن و چاپ دەکرێن.

٥- بۆ ئەوەی منداڵ دڵنیا بکرێ لەوەی ئەیبینێ تەنیا ئەوەندە بەس نییە کە کۆمەڵە
گیانلەبەرێک ببینێت و ڕۆڵی مرۆڤ ببینن، ئەم کارە لە هەموو کاتێکدا بە پێز نییە، لە
کاتی قسەکردن یان نووسین بۆ منداڵ هەروەک چۆن پێویستە بە هیچ جۆرێک درۆ نەکرێ
ئاواش پێویستە بەدڵنیاییەکی وەها باسی ڕووداوێک نەکرێ کە بە دروستی نازانرێ چۆنە،
ئەمەش وەک پێگەیەک بۆ هەموو کارێکی ئەدەبی تەنانەت بۆ ژیانیش پێویستە. کتێب
کارێکی زۆرگەورە دەکاتە سەر منداڵ هەربۆیە پێویستە حەقیقەتی ژیان هەر وەکو خۆی بۆ
منداڵ بگێڕدرێتەوە لەو کاتانەش دا کە باری هونەری پێویستی بە پەنا بردنە بەر دەربڕینی
(مجازی) یە، نابێ ئەم مجازیەتەو دەستکارییە سنووری عەقڵ و ماقوڵی تێپەڕێنێ.بە
تایبەتی لێرەدا ئەوەش گرنگە کە بەرهەمە دیاریکراوەکە بۆ چ قۆناغ و تەمەنێکی منداڵێتی
دەنووسرێت.

**بۆ نموونە** سەلام مەنمی لە چیرۆکی هێلانەدا باسی ئەوە دەکا کە کۆترێک سێ هێلکە پێکەوە دەکا





(بەلام لە ڕاستیدا کۆتر ناتوانێ لە دوو هێلکە زیاتر بکا بە جارێک). پاشان بە بێ هیچ
هۆیەکی زانراو بێچوەکانی دەداتە قەلە ڕەشێک، پاش ماوەیەک کە بێچوە قەلەکان و بێچوە
کۆترەکان پێکەوە دەژین، بێچوە کۆترەکان دەگەڕێنەوە لای دایکیان ئەگەر چی پێشتر تەنیا
جارێکیش دایکیان نەبینیوە، لێرەدا باشتر وا بوو بۆ چیرۆکنووس، لە جیاتی گەڕانەوەی
بێچوەکان بۆ لای دایکیان کە ناپناسن باسی ئەوەی بکردایە کە چۆن بێچوە کوترو بێچوە
قەلەکان بوونە هاورێ و هاو خەمی یەک.

دیارە لێرەدا قسان لەسەر فانتازیا نییە کە لە فەزاو پانتاییەکی تردا کار دەکات. فانتازیا
نووسین لە چیرۆک و ڕۆماندا نووسەری کارامەو شارەزای دەوێت و لە سەر ئاستی جیهانیش
ئەو نووسەرانە زۆر کەمن، کە ژیان و واقیچ دەبەنە ئاستێکی بەرزترو لە پانتاییەکی فەنتازیا
ئامێزدا بە شێوازی ناسوونەتی و نامەئلوف دیاردەیەک یان بابەتێک بۆ منداڵ دەنووسن.

٧- پەندی پێشینان و مەتەڵ وحیکایەت و داستانی میللی پڕە لە جوانناسی و فیکری بە پێز،
بەلام بۆ منداڵ پێویستە شیبکرێنەوە و گیانی هاوچەرخانەیان بەبەردا بکرێ.

سەرکەوتنی نووسەری تایبەت بە منداڵ تا ڕادەیەک پەیوەستە بەوەی کە زیرەکانە بابەت بۆ
منداڵان هەڵبژێری و هاوچەرخانە لەمێشک و دەروونی منداڵان نزیکیان بکاتەوە.

چیرۆکی (لەهۆی هەزاران) ی شاکر فەتاح یەکێکە لەو چیرۆکە تایبەتمەندانە کە هەڵوێستێکی
خێرخوازانە و هێمن و دۆستانەی تیایە و گفتۆگۆی منداڵ لە گەڵ باوکدا بە بیردێنێتەوە،
بەڕای من چیرۆکاکانی نەجات ڕەفیق حیلمیش سەرکەوتن لە هەست ونەستی شیرینی
دایکایەتییەوە وەردەگرن.

٧- نووسەر دەتوانێ ڕۆڵێکی مەزن بگێڕێ لەوەی کە گیانی خۆشویستنی زمانی دایک لای
منداڵ گەشە پێبدا و هەر لە منداڵییەوە زەمینەی بە هێز بوون و ڕەسەنایەتی لای منداڵ
دروست بکات یان بە پێچەوانەکەیەوە وەک هەندێ نووسەر کە زمانێکی بێفەڕو وشەی قورس
و داتاشراو دەخەنە ئەو بەرهەمانەوە کە بۆ منداڵان نووسراون. یان هەندێ نووسەر کە زۆر
وشەی زمانانی بێگانە بەبێ هیچ بەڵگەو پێویستیەک تێکەڵ بە زمانی کوردی دەکەن.

**بۆ نموونە** چیرۆکی جوانترین دیی لەتیف هەڵمەت یەکێکە لەو چیرۆکانەی کە هەم وشەی بێگانە و
هەم دەربڕینی قورس و سەختی تیایە سەبارەت بە منداڵ. بیلینسکی لەم ڕووەوە دەڵێت:
ئەو زمانەی کە بۆ منداڵ پێی دەنووسرێ دەبێ تایبەت مەندێتی خۆی هەبێ و ئاسان و ڕەوان
و دروست بێت، زمانێکی گەشاوە و ساکار بێت، بەو زمانە بنووسرێ کە باوە و قسەی
پێدەکرێ،

لە هەمان کاتدا ڕەوانبێژی و بەهاوگونجان و ڕێزمانی خۆی بپارێزێ. لێرەدا دەکرێ ئاماژەی

نووسەرێک لەم ڕووەوە بکرێ. عومەر عەبدولرەحیم کە بەزمانێکی جوان و دەربڕو ڕەوان دەنووسێت.

٨- هەڵبژاردنی بابەت بۆ چیرۆک و هەر بەرهەمێکی تری هونەری بایەخێکی مەزنی هەیە. مێرمنداڵان لە سەرنجدانی ئەم بابەتەدا تایبەتمەندی خۆیان هەیە لەو بابەتانەش کە بۆ منداڵان گرنگن و لەئەدەبی منداڵانی تەواوی گەلانی دنیادا شوێنی خۆیان گرتوەتەوە ...خۆشویستنی دایک و باوک و نیشتمان، کۆشش بۆ خوێندن و فێر بوون و، هێزو تواناو داکۆکی کردن لە ئازادی و بوون بە قارەمان و ململانێیە.

بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ژمارەیەک لە نووسەرانی کورد بە هەندێ بابەتی دیاریکراوەوە نووساون. ساڵ لە دوای ساڵ هەر ئەو بابەتانەن و لەچیرۆکی ئەم و ئەودا دەبینرین گۆڕانێکی گەورەو هونەریی سەرنجڕاکێش لە بەرهەمەکانیاندا نابینرێ.

لە کۆتاییدا هەوڵ دەدەین هۆکانی ئەم کەموکورییە جیدییانە لە هونەری چیرۆکی منداڵانی کوردا دیاری بکەین:

١- ئەدەبی منداڵان بە زمانی کوردی ئەزموون و تاقیکردنەوەیەکی نوێیە لە هونەری ئەدەبی کوردی دا. دەتوانین هەموو قۆناغەکانی ئەدەبی منداڵانی کورد بەو زەمینەیە دابنێین کە لەمەوپاش کاری گەورەی بەسەرەوە بنیاتبنرێت.

٢- نکوڵیکردنی هەندێ نووسەران لە هونەری میللی، لە فۆلکلۆرو کەلەپوری میللی بە چاوی کەم سەیر کردنی کەلەپور.

٣- نەبوون یان لاوازبوونی ڕۆژنامەگەریی تایبەت بە منداڵان.

٤- لاوازی وەرگێڕانی هونەری گەلانی تر بۆ زمانی کوردی، پێویستە منداڵ لە چوارچێوەی ڕۆشنبیری نەتەوایەتی دا گۆشەگیر نەکرێ و هەر لەسەرەتاوە گەرای شارەزا بوون و چاوکراوەیی بەرامبەر بە هونەرو ئەدەبی گەلانی تری لا دروست بکرێ و ئەمەش زیاتر یارمەتی دەدا بۆ بیر فراوانی و دەرککردنی خێرا و تێڕوانینی قووڵ سەبارەت بە جوانی نیشتمانەکەی و زیاتر بەستنەوەی بەم نیشتمانەوە فێر بوونی ئەوەی کە بە هیچ جۆرێ نابێ دەستبەرداری نیشتمان و زمان و نەتەوەی خۆی بێ و لە هەمان کاتدا خۆی و گەل و نیشتمانەکەی بە جیهانێکی گەورەترەوە ببەستێ.

بایەخدان و سەرهەڵدان و گەشەسەندنی ڕەخنەیەکی زانستییانە سەبارەت بە ئەدەب و هونەری منداڵانی کورد پێویستییەکی گەلێک گرنگە لەلایەک بۆ ئەوەی بەرهەمی نەزۆک و بەرهەمی بەپێز لێک جیا بکرێنەوە و لە لایەکی ترەوە بۆ ئەوەی هەر لە سەرەتاوە منداڵان فێری دیقەتکاری و وردبینی بکرێن و کولتووری ڕەخنەیان وەک ڕۆشنبیرییەکی هاوچەرخ لا دروست بێت.





## ئەنجام

لە سەدەی بیستەمدا ئەدەبی منداڵانی کورد سەری هەڵدا، بەشێوەی گۆرانی و شیعری شاعیرانی گەورەی کورد، ئێستاش ئەم ئەدەبە وەک بەشێکی سەربەخۆ لە چوار چێوەی هونەری نەتەوایەتیدا گەشە دەکا.

بیرو باوەڕی پێشکەوتنخوازی کە لەسەرەتای سەدەی بیستەم لە شۆڕشی ڕووسیا و شۆڕشە دیموکراتیە بۆرژواکانەوە سەریهەڵدا، هەروا ئەو ئاڵوگۆڕەی لەهەمان ماوەدا بەسەر ئەدەبی تورکی و فارسی دا هات، سەرجەم ئەمانە کاریان کردە سەر ڕۆشنبیریی هاوچەرخی کورد بە ئەدەبی منداڵانیشەوە وەک بەشێک لەو ڕۆشنبیرییە.

ئەدەبی منداڵانی کورد هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانییەوە پەیوەندییەکی ئۆرگانیکی بە فۆلکلۆرەوە هەبوە و لە سەرەتادا ڕاستەو خۆ لە فۆلکلۆرەوە ڕەگی گرت، ئەمەش لەو گۆرانی و شیعر و یاری و نیگارو مەتەڵ ومەتەڵە فۆلکلۆریانەدا دەردەکەوێ کە لە کاتی لایلایەو خلافاندنی منداڵ دا دەوترێن.

دامەزرێنەرانی ئەدەبی منداڵانی کورد (زێوەر، بێکەس، پیرەمێرد و گۆران.....) بەشێوازی هونەری و لەسەر بنچینەی فۆلکلۆرو ڕۆشنبیریی میللی ئەدەبی منداڵانیان چەسپاند. ئەو شیعرو سروودانەی کە گۆران و بێکەس بۆ منداڵانیان نووسیوە چ ئەوانەی فۆلکلۆری بوون و ئەوان تازەیان کردوەتەوە، یان ئەوانەی ڕاستەوخۆ لە لایەن خۆیانەوە نووسراوە مۆرکێکی ڕیالیستانەیان هەیە و بەزمانێکی شیرین و هونەری ڕەوان نووسراون.

بابەتەکانی ئامۆژگاری و ڕێنوێنی لەبەرهەمی شاعیران و نووسەرانی کلاسیکدا بەشێکی پێویست و ئیلزامی بوون چونکە زوربەی ئەو بابەتانە پەیوەندییان بە بوون و بۆچوونی ئایینییەوە هەبوە و لە بنچینەشدا لە لایەن پیاوانی ئایینی و زانا بەناوبانگەکانەوە کە ڕۆڵی مامۆستایان بینیوە پێشکەش کراون.

پەروەردەکردنی نەوەی نوێی لاوان بە بیروباوەڕی ئایین و باسکردنی خێرو شەڕو ئازادی و هەق و ناهەق و ڕاکێشانیان بۆ تێکەڵ کردنی ئەم ڕێبازە بۆ ژیان کە مەبەستی سەرەکی ئەو بابەتانە بوە و ئەمانەو سەرجەمی کەلەپووری ئامۆژگارییانەی کلاسیک، بونە زەمینەی سەر هەڵدانی ئەدەبی نوێی منداڵان.

لە سەدەی بیستەم دا شاعیرانی کورد باشترین سودیان لە شێوازی کلاسیکیانەی ئەدەب وەرگرت و لەو بابەتانەی تایبەت بۆ پەروەردەکردنی منداڵ نووسراون کەڵکیان لێوەرگرت.

بێکەس لە کەسایەتی باوک و مامۆستا لە شیعری کلاسیکی رۆژهەڵات سودێکی باشی وەرگرتوە و داهێنانێکی بەرچاوی خستوەتەڕوو،کردوونیەتە بابەتێکی پەروەردەیی رۆژگاری خۆی. لەو نموونانەی ئەدەبی ئامۆژگاری بۆ فێر بوون کە لە ڕابردوودا تایبەت بۆ منداڵان نووسراون هەروەک سەرچاوە رۆڵی بەرچاویان بۆ سەرهەڵدانی ئەدەبی منداڵانی کورد نواندووە و ئەو فەرهەنگە عەرەبی - کوردی یە (نۆ بەڕە و ئەحمەدی) و هۆنراوەی عقیدەی مەولەوی، دوایی بێکەس و گۆران. پاشان لە چلەکانەوە تا شەستەکان لەو کاتەیدا کە ئەدەبی کوردی بەرەو قۆناغی ڕیالیستیانە پەڕییەوە ئەم پەرەگرتنە زیاتر بەر چاو دەکەوت، ئاشکرایە گرنگیدان بە فۆلکلۆر و کارتێکردنی پەیوەندی بەسەرهەڵدانی هۆشمەندی نەتەوەی کوردەوە هەیە و یەکێکە لە نموونەکانی گەشە سەندنی ڕۆشنبیری نەتەوایەتی. نووسەرانی ئەم قۆناغە (کاکەی فەلاح، ع.ع.شەونم، عومەر عەبدولرەحیم و فەرەیدونی عەلی ئەمین.....) کەڵکێکی تەواویان لە فۆلکلۆر وەرگرتوە و پاش ڕێکو پێک تر کردن و داهێنانی هونەری بەهرەدارانە دایانڕشتوونەتەوە.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدە بۆ سەرەتای سەدەی بیست کە هۆشمەندی بۆرژوای کورد سەریهەڵدا بیرو باوەڕی رۆشنکاریش هاتە مەیدان و گەلێک بابەتی تازەی وەک داد پەروەری و یەکێتی نەتەوەیی پەیدا بوون کە لە بەرهەمەکانی زێوەر و بێکەس و پیرەمێرد و گۆراندا رەنگیان داوەتەوە. بیرو باوەڕی ڕۆشنکاری تەنیا کارێکی قووڵی نەکردە سەر ئەدەبی منداڵان و بەس بەڵکۆ چوار چێوەی زەمەنی سەرهەڵدانیشی تا رادەیەکی زۆر دیاری کرد چونکە کەسانی رۆشنکاری کورد هەر خۆیان مامۆستاو پیاوانی کۆمەڵایەتی و شاعیر و رۆژ نامەنووس بوون و هەر ئەوانیش بوون کە باسی گرنگیەتیی سیاسەتی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییان لە پەروەردەکردنی نەوەی نوێدا باسکرد و گۆرانی و سروود و شیعریان بۆ منداڵان وتوە. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم ئەوان بەشێک بوون لە کەسانی پێشکەوتنخوازی کۆمەڵگەی کوردی کە هانی منداڵانیان داوە بۆ خوێندن و بەگژ ئەو کۆسپانەدا چوون کە بوونەتە بەربەست لەبەردەم چوونی کچان بۆ قوتابخانە.

هەر لە سەر دەستی ئەو شاعیر و نووسەرانەش بیروباوەڕی ڕۆشنکاری هاتە ناو شیعر و ئەدەبی منداڵانی کوردەوە وەک بایەخدان بە زانست و خوێندن وەک پێشەکییەکی پێویست بۆ ختیاری مرۆڤ و ئایندەی رۆشنی تەواوی گەل.





مێژووی ئەدەبی منداڵانی کورد کاتێک کە لە قۆناغی سەرەتاییەوە پەڕییەوە قۆناغێکی پێشکەوتوتر لە ساڵانی چل و شەستەکاندا لە چوارچێوەی ڕێبازی ڕۆمانسیانەدا مەیلی ڕیالیستیانە سەریهەڵدا. ئەمەش لە هەڵبژاردنی تەوەری ڕووداوەکان و سروشتی قارەمانەکاندا دەبینرێ.

لە قۆناغی دووەمی تایبەت بە منداڵ سروشتی ئەخلاقی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی تێکەڵاو بە هونەر لە قارەمانی بچوکدا دەرکەوت. بۆ ئەمەش دەتوانین سەرنجی کۆمەڵە شیعری (قارەمانی ئایندەی) عومەر عبدالرحیم و فەرەیدون عەلی ئەمین بدەین.

بابەتی خوێندن و قوتابخانە لەبەرهەمی ئەو شاعیرانەدا لە ریزی پێشەوەی بابەتەکانی تردا دەبینرێن بە تایبەتی لە بەرهەمە بە پێزەکانی کاکەی فەلاحی شاعیردا. لەم قۆناغەدا پەیامی قارەمانی ناو ئەو شیعرانە پەیامێکی جیاوازە لە پەیامی قۆناغەکانی پێشوو کە هاندانی چوونە بەرخوێندن و بڵاوکردنەوەی خوێندەواریی بووە.

واقیعی کۆمەڵایەتی کوردەواریش ئەم قۆناغەی تێپەراندوە، لەو ڕۆژگارەدا بابەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی سەرتۆپی بابەتەکانی شیعری کوردی بوون بە گشتی و هەروا لە شیعری منداڵانیشدا بە تایبەتی لەم بوارەدا داهێنانەکانی عمر عبدالرحیم و ع.ع شەونم بەبەرجەستەکراوی دەبینرێن. ع.ع.شەونم تەنیا وەک شاعیرێک لە دەوڵەمەند کردنی ئەدەبی منداڵاندا کاری نەکردوە و بەس، بەڵکو لەو پێشەکییەیدا کە بۆ دیوانی جریوەی نووسیوە بابەتێکی تیۆری بە پێزی لەمەڕ پرینسیپە هونەری و فیکرییەکانی ئەدەبی منداڵان باسکردوە و شوێن و ڕێی پەرە سەندنی ئەم ئەدەبەی بە بەڵگەو نموونە دووپات کردوەتەوە. ئەو لەوێدا سیمای ئەخلاقی ئەو ئەدیبانەی بۆ منداڵان دەنووسن دیاری دەکا و باسی ئەوە دەکا کە ئاستی جوانناسی ئەو شیعرانەی بۆ منداڵان دەنووسرێن دەبێ لە گەڵ حەزو ویست و پێویستییاندا بگونجێن و پێویستە بابەتەکانی منداڵ وەڵام بدەنەوە.

گەلێک لەو بیروڕایەی ع.ع.شەونم خستونیەتە ڕوو لە گەڵ بیرو ڕای پسپور و نووسەرانی ڕووسدا دەربارەی ئەدەبی منداڵان یەکدەگرنەوە بە تایبەتی لە گەلێ بیرو ڕاکانی دەبرەلۆبۆف کە ئەوە دووپات دەکاتەوە، ئەدەبی منداڵان دەبێ دیمەنی زیندوو و قەشەنگ و زمانی نەتەوایەتی ئاوێنە بکاتەوە.

م. گۆرکیش لەم ڕووەوە دەنووسی ئەو نووسەرانەی بەرهەم بۆ منداڵ دەنووسن دەبێ گرنگی زانیاری دەروونی جیهانی منداڵان بە وردی و دیقەت تێبگەن و مارشاکیش ئەوە دووپات

دەکاتەوە کە ئەم نووسەرانە دەبێ ( شارەزاییەکی باشیان هەبێ و پێویستییەکانی پەرەسەندنی ڕووداوەکانی ناو بابەتەکان و سیمای کەسایەتی ناو ئەو بەرهەمانە و پلەی زەوق و سەرنجڕاکێشان لەبەر چاو ون نەبن.

گومان لەوەدا نییە کە ئەدەبی منداڵانی کورد لە گەڵ ئەو کەموکووڕیانەی تا ئێستا تیایدا دەبینرێن بە ڕادە و پلەیەکی چاک گەیشتوە و ئێستاش ئەو بابەتانە دەخاتەڕوو کە واقیعی ئاڵۆزی هاوچەرخ سەبارەت بە پەروەردەکردنی نەوەی نوێ و ژیانی تازەی کۆمەڵایەتی سیاسی کوردەواری دەیخاتە ڕوو. ئەو بەرهەمانەی کە لە چلەکان و شەستەکاندا خراونەتە ڕوو نیشانەی ئاستی بەردەوام لە زیاد بوونی جوانناسی لە ئەدەبی منداڵاندا پیشان دەدا و بەرەو کامڵ بوونی ئەم ئەدەبە ئاوێنە دەکاتەوە.

هەروا سەرەڕای بیروڕای نیشتمانی و نەتەوایەتی بیروڕای مرۆڤایەتی و نێو نەتەوەیی لە ئەدەبی منداڵانی کورددا لەو بابەتانەن کە سەرنجڕاکێشن و لە شێوازی هونەری دا ڕەنگیان داوەتەوە.

ئەگەر سەرنجێکی تەمەنی شەست ساڵەی ئەدەبی منداڵانی کورد کە ئەدەبێکی سەرەتایی و پاشکۆی ئەدەبی ڕۆشنکاری کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست بدەین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەم ئەدەبە لە چوارچێوەی ئەدەبی گشتی کوردستاندا لە قۆناغی بەرەو کامڵ و سەربەخۆ بوون هەنگاو هەڵدێنێ و سیمای تیۆری گشتی و ئەرکی تایبەتی خۆی وە ئەستۆ گرتووە.





## ژێدەرەکان


١- لاپەرە ئینسیکلۆپیدیای ئەدەبیی. بەرگی دووەم، چاپی ڕووسیی. ١٩٦٤ ل ٦٠٨

٢-. گۆرکی. ئەو مرۆڤەی کە گوێچکەکانی بە پەمو ئاخنران.کتێبێک دەربارەی ئەدەبی منداڵان. مۆسکۆ. ١٩٥٨. ل. ١١٤

٣- مینۆرسکی. کورد. پیترۆگراد. ١٩١٥. ل ١٦

٤- فۆلکلۆری کوردی. ئۆردوخانی جەلیلی و جەمیلە جەلیلی. مۆسکۆ، ١٩٧٨ ل٧

٥- گ.س.ڤینۆگرادەف. پەروەردەکردنی میللی.لە کتێبی داب و نەریتی سیبیری. مۆسکۆ.١٩٢٦،ل٢٨

٦- ا.و. کاپیتسا. فۆلکلۆری منداڵان. لینینگراد.١٩٢٨، ل٥

٧-کرافتسۆن، لازوتین. داهێنانی میللی سەرزارەکی ڕووسی. مۆسکۆ.١٩٨٣، ل ٢٧٥

٨- نۆڤینکە. داهێنانی شیعری میللی ڕووسی. مۆسکۆ.١٩٧٨، ل ١٣٢

٩- ب.پ. ئەنیکین. پەندی پێشینان و قسە و مەتەڵی ڕووسی و فۆلکلۆری منداڵان. مۆسکۆ.، ١٩٥٧، ل ١٦

١٠- ڤینۆگرادەف. سەرچاوەی پێشوو. ل ٤

١١- کاپیتسا. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل ٣١

١٢- فاسیلێنکۆ. فۆلکلۆری ڕووسی هاوچەرخ. مۆسکۆ. ١٩٦٦، ل ١٨٧

١٣- ئەنیکین. هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل ١٠١

١٤- کاپیتسا. سەرچاوەی پێشوو.ل ٦

١٥- تۆلستۆی. کۆی بەرهەمەکانی، بەشی ١٣. ساڵی١٩٢٨، ل٣٦٣

١٦-پەرتوکی ئەلف بای کوردی، یریڤان ١٩٨٢ ل٩٧

١٧- ئەدەبی منداڵان. ی.ب. دانیلۆڤسکی. مۆسکۆ.١٩٧٨، ل٣

١٨- چوکۆڤسکی. منداڵی بچووک.لێنینگراد. ١٩٢٩

١٩- کرافتسۆڤ و لەزوتێن. داهێنانی سەرزارەکی میللی ڕووسی. مۆسکۆ.. ١٩٨٣،ل ٩٣

٢٠- سۆخەملێنیسکی. دڵم ئەدەم بە منداڵان. کییف. ١٩٧٢،ل ١٥٣

٢١- گۆڤاری ئۆتۆنۆمی. "چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی لە ئەدەبی منداڵاندا" نووسینی عەبدول غەنی عەلی یەحیا. ژ. ٢ ساڵی ١٩٨٣.

٢٢-هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٣ر گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ. " هەندێک داب و نەریتی باراب بارێن و وەستانی لە لای میللەتان" کەریم مستەفا شارەزا. ژ. ١٢٣ اساڵی ١٩٨٩

٢٤- ئا.ئا. پەتێبنیا.دەبارەت هەندێ سیمبۆڵەوە لەئەدەبی سەرزارەکی سلەڤیاندا.خارکۆڤ.١٩١٤ل٢٦

٢٥- ڤینۆگرادڤ. سەرچاوەی پێشوو. ل ٢٦-٢٧

٢٦- ئەلكۆنین. سایكۆلۆژیای مندالّ. مۆسكۆ. ١٩٦٠ ل ١٤٨
٢٧- چۆكۆفسكی. سەرچاوەی پێشوو. ل ١٠٤
٢٨- تۆلستۆی. بیرەوەرییەكانی سەرەتا. تەواوی كارەكانی بەشی یەكەم.مۆسكۆ.١٩١٢ ل٣٢
٢٩- چوكۆفسكی. سەرچاوەی پێشوو. ل٣
٣٠- چوكۆفسكی. هەمان سەرچاوە ل ٣١
٣١-ئەلفابای كوردی.یەریڤان.١٩٨٠. ل ٩٩- ١٠٠
٣٢- هوشیار سیوەیلی. كۆمەڵێك گۆرانی مندالاّن لە فۆلكلۆری كوردیدا. گۆڤاری بەیان، ژمارە٥٢، ١٩٧٨
٣٣-فۆلكلۆری ڕووسی، بەرگی ٢٠ مۆسكۆ. ١٩٦٩، ل ٩٨.
٣٤- سەر چاوەی پێشو ل ٩٧
٣٥- ڤیكۆتسكمان -مۆسكۆ ١٩٦٧ ل ٢٧
٣٦- ئینسكلوپیدیای ئەدەبی، بەرگی دوو، مۆسكۆ ١٩٦٤ ل ٦٠٨
٣٧- باسێک لە سەر مێژووی ئەدەبی تازەی كورد. مۆسكۆ.١٩٦٧، ل٤٩
٣٨- گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد. بەرگی چوارەم. ١٩٧٦. بەغدا، ل ٥٠
٣٩- ڕۆژنامەی هاوكاری١٨ /٨ /١٩٨٣. چەند دێڕێک دەربارەی مەحەمەد باشقەی خاوەن یەكەمین قرایتی كوردی. نەریمان.
* محمد باشقه لە سالی ١٨٩٠ لە بەغدا لە دایكبووە و قوتابخانەی ئینگلیزی تەواو كردوە، زمانی توركی و ئینگلیزی و فەرەنسی خوێندوە و خۆشی زۆر بە زمانی فارسییەوە خەریک كردووە.
٤٠- ڕۆدینكە. ڕوونكردنەوەی دەستنووسە كوردییە كۆكراوەكان. لێنینگراد. مۆسكۆ. ١٩٦١. ل ٥٢
٤١- هەمان سەرچاوەی پێشوو ٥٣
٤٢- مەولەوی عەقیدی مەلەوی. بەغدا.١٩٧٧، ل٤
٤٣- ئەنتۆگرافیای مندالاّن. گوتاری هاوبەشی فاسیلیڤا و جەمشید حەیدەری. دەربارەی سازدانی كۆمەلاّیەتی مندالانی كورد. مۆسكۆ.١٩٨٣، ل ٢٣
٤٣- دیوانی زێوەر، بەغدا ساڵی ١٩٥٨ ل ٨٦
٤٥- دیوانی زێوەر. ل ٤
٤٦-محەمەد ڕەسول هاوار. پێشەكی دیوانی پیرەمێرد. ١٩٧٠. ل ٩
٤٧-د. مەعروف خەزنەدار: كورتەیەک دەربارەی مێژووی ئەدەبی كوردی ل١٦٩ ٤٨- دیوانی بێكەس. بەغدا. ١٩٨٠. ل ٣٩
٤٩- گۆركی. ئەدەبی مندالاّن. بەرگی ٢٧، مۆسكۆ.١٩٥٣. ل ٣١
٥٠-مینورسكی. الاكراد، الملاحظات والانطباعات. پتروغراد.١٩١٥، ل ١٦





٥١- مەعروف خەزنەدار. كورتەیەک دەربارەی مێژووی ئەدەبی كوردی. مۆسكۆ.١٩٦٧ ل ١٦
٥٢- سەرچاوەی پێشوو. ل ١٠٢
٥٣- نەجمەدین مەلا، كەشتی نوح. سلێمانی ١٩٦٨، ل ٧
٥٤- مستەفا نەریمان، لێكۆڵینەوەیەک دەربارەی نەجمەدین مەلا. بەغدا. ١٩٦٨. ل ١٦-١٧
٥٥- ن.ا دەبرەلوبۆف. تەواوی بەرهەمەكانی، نۆ بەرگ. مۆسكۆ- لینینگراد. ١٩٦٤- ١٩٦١. بەرگی چوار. ل ٦٦
٥٦- بیلینسكی، تەواوی بەرهەمەكانی. مۆسكۆ، ١٩٥٣-١٩٥٩ بەرگی دوو ل٣٧٩
٥٧-

**ژێدەرەكانی تر**

- گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ژ.٢. ١٩٨٣. ل ١١٧
- عبدولڕەزاق بیمار.سەرەتای ئەدەبی مندالاّن. گۆڤاری نووسەری كورد.. ژ ٣، ل ٢٣
- عەبدوڵلاّ پەشێو. داهێنانی شاعیری پێشكەوتنخوازی كورد پیرەمێرد.١٩٨٣
- ڕۆژنامەی عێراق. ژ ١١٢٧، ١٢ /١/ ١٩٧٩.
- گۆڤاری نووسەری كورد ژ. ٣. ١٩٧٩ بەغدا
- فۆلكلۆری كوردی. عەبدولغەبی عەلی یەحیا.العراق. ژ.١١٦٣. ساڵی ١٩٧٩.
- عەلادین سەجادی، مێژووی ئەدەبی كوردی، بەغدا. ١٩٥٢
- دیوانی زێوەر، بەغدا ١٩٥٨.
- دیوانی پیرەمێرد. ١٩٧٠
- دیوانی بێكەس.بەغدا. ١٩٨٠
- دیوانی گۆران. بەغدا ١٩٨٠
- حوسەین حەبەش. گۆڤاری هاوارو ڕۆڵی لە پەرەسەندنی ڕۆشنبیری كوردی.
- عەبدولواحد نوری. پیرۆزی مندالاّن، سولەیمانی ١٩٤٠
- عزالدین مصطی رسول. الواقعیه فی الادب الكردی